مەسعوود محەمەد

# دەمودووی هزر

وەرگێڕی بابەتەکان

حەکیم کاکەوەیس

کوردستان 2013

مەسعوود محەمەد

دەمودووی هزر

وەرگێڕی بابەتەکان

حەکیم کاکەوەیس

حەساری گەورە، کەرکووک ,کوردستان 2013

## پێڕست

## پێشەکیی یەکەم بابەت...

پەنجا ساڵ زیاترە ئەم نووسینانەی مامۆستا مەسعوود محەمەد بڵاو کراونەتەوە، کەچی ئێستاش سوودی خۆیان هەیە و چمکێکی مەیلەو تاریکی ئەو سەردەمەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە و دەکرێ هەڵوێستی ئەوسا و ئێستای خۆمان لە بەر ڕۆشناییان پێوانە بکەین. ئەم بە تەنگەوە هاتنەی مامۆستا بۆ عارەبە قەومییەکانی ئەو دەمە و ئەو هاواری دەستگرتن و هاوکارییەیان لە کوێوە سەرچاوە دەگرێ؟. ئەوەی من لێی تێدەگەم بڕگەیەک لە نووسینی د. عەبدلڕەزاق محێدین ئەوەندە کاری تێ کردووە، ئەم شاکارانەی پێ نووسیوە و لە هەمان کاتدا خەسڵەتێکی زەقی کورد لەم هەڵوێستەی مامۆستادا بە بەرجەستەیی دەبینم ئەوەش ئەوەیە هەر کەسێ یەک سڵاو لە کورد بکا، کورد سەد سڵاوی لێ دەکا، کەچی دەبینین لەوساوە تا ئێستا عارەبی قەومی چی بە کورد کردووە. من پێم وایە ئەگەر عارەب بە ڕاستی قەومی بێ و زوڵمێک قەبووڵ نەکا کە لە قەومەکەی دەکرێ، خۆبەخۆ ڕێزی قەومی تریش دەگرێ و چی بۆ قەومی خۆی بە پێویست و ڕەوا دەزانێ بۆ قەومی تریش بە پێویست و ڕەوای دەزانێ. بەڵام قەومییەت کە بەرەو خۆبەزلزانین لایدا، ئیتر خەسڵەتەکانی نازییەت هەڵدەگرێ و بۆ سەر قەومەکانی تر دەبێتە مەترسی. مامۆستا مەسعوود محەمەد لەو ڕوانگەیەوە ڕوانیویەتیە عارەبە قەومییەکان بۆیە هەوڵی نزیکبوونەوە و ڕاگۆڕینەوەی لەگەڵدا داون. بەڵام بەعسییەکان، هەر لەو سەردەمەوە خەتی مرۆڤایەتی قەومایەتییان بەزاندووە و هەوڵی سڕینەوەی پێناسەی کوردیان داوە و عیراقیان بە دەوڵەتێکی عارەبی ناسیوە و بەوەش کوردیان سڕیوەتەوە کەچی پارتی کوردستانی، کە ئەو دەمە هەندێ لە سەرانی مارکسی لینینی بوون و بە لای کۆمۆنستەکاندا دایاندەشکاندەوە، بە قسەی مامۆستا مەسعوود، پەیماننامەیەکیان لەگەڵ

بەعسییەکاندا مۆر کردووە کە تیایدا عیراق بە بەشێکی دانەبڕاوەی ئوممەی عارەبی داندراوە.

د. عەبدلڕەزاق محێدین لە گوتارێکدا بە ناوی «نەتەوەیەک لە یەک ژووردا دەخوا و دەخەوێ و خۆی دەشوا» لە لاپەڕە 43ی کتێبەکەیدا کە ناوی لێ ناوە «لە پێناوی مرۆڤی عیراقدا» لە بارەی کوردەوە نووسیویەتی:

*بە گوێرەی حیزبە قەومییە کوردییەکان مەسەلەکە ڕوونتر و گرنگترە و نازانم چۆن کوردە قەومییەکان لە بن یەک میچدا لەگەڵ کۆمۆنستەکاندا کۆ دەبنەوە؟*

*نەتەوەی کورد ڕاستییەکی هاشاهەڵنەگرە و گەلی کورد هەموو خەسڵەت و پەیام و ڕۆحی نەتەوایەتی تێدا هەن: لە یەک ڕەسەنی و لێکنزیکی هاونیشتمانییەوە بگرە تا دەگاتە پێگگەیشتنی زاراوەکانی و تاقیکاری هەستی ڕۆڵکانی و پێداویستی گرنگیدان بە پێگەیشتنی کەسایەتی و ڕاستبوونەوەی وەک ڕاستییەکی باڵا لە نێو نەتەوە و گەلاندا.*

*هەموو ئەوانە ڕاستن و ڕاستییەکی ئەوتۆن لە میللەتانی تر زیاتر پێویستییان بە توانا و بەهێزبوون و ڕاهێنان و فێربوون هەیە: لە ماڵەوە و لە قوتابخانە و لە گوند و لە شار، لە دۆڵ و لە شاخ، لە مزگەوت و خانەقا و تەکیە، لە هەر جێیەک کە کوردی لێ هەبێ..*

*کورد پێویستی بەوانەیە چونکە نەتەوەیەکە بەو بارودۆخەی دەورە دراوە و بەو پێگەیشتنەیەوە پێویستی بەوپەڕی چاودێری و گەشەسەندنە و لە هەموان شایستەترە بۆ ئەوەی پێداویستی ژیان و گەشەکردنی بۆ فەراهەم بکرێن.*

بەڵام ئەوانەی خۆیان بە کوردی نەتەوەیی دەزانن چۆن لە بواری سیاسی کۆمەڵایەتیدا پەنا بۆ ماددییەتی مارکسی لینینی دەبەن؟ پەنابردن بۆ بنەماکانی لینینی مارکسی پێچەوانەی ڕۆحی نەتەوایەتییە و بەر لەوەی بناغەی دامەزرێ وێرانی دەکا و مینرێژکردنی بناغەکەیەتی و پێش ئەوەی بیناکە دامەزرێ دەیتەقێنێتەوە.

نازانم چۆن دایک و باوک و مامۆستا بە پەنابردن بۆ بنەماکانی مارکسی لینینی بناغەی هەستی نەتەوایەتی لە ناخی تازە پێگەیشتووەکاندا دەچێنن.

بۆ نموونە پێی دەڵێن: "ئەی کوڕی گەنج تۆ سەر بە گەلی کوردی و سەرچاوەی کورد یەک ڕەگەزە و نەریت و خەسڵەتی کۆنی ڕەسەنی هەیە". ئەوجا بە پشتبەستن بە بنەماکانی لینینی مارکسی ئاوها قسەکەیان لەگەڵیدا تەواو دەکەن: بەڵام مەسەلەی ڕەگەز و سەرچاوە خورافات و وەهمە. خەسڵەتی چاک و ڕەگی قووڵ درۆن و لە داهێنانی قەومییە شۆڤیەنییە دەجاڵەکانن.

ئەوجا لە سەری دەڕۆن:

ئەو گەلە ڕەسەنە نەمرە نیشتمانێکی هەیە و هەر لە کۆنەوە لە سەری ژیاوە و خوێنی باوباپیرانی تێکەڵی خۆڵ و ئاوەکەی بووە و بۆتە بەشێکی و هەواکەیان هەڵمژیوە و هەناسەیان تێکەڵی بۆنی بووە و لە کوردەوە بووە و بۆ کورد بووە.

ئەوجا بە پشتبەستن بە بنەماکانی لینینی مارکسی فریا دەکەون و پێی دەڵێن:

*بەڵام ئەی کورپژگە نیشتمانێکی تری دایک هەیە و لەو نیشتمانە نێزیکتر و گرنگترە ئەوەش کۆمۆنیزم و کۆمۆنیستەکانە و باوباپیرانت تێیدا نەژیاون و ئاوەدانیان نەکردۆتەوە و هەوایان هەڵنەمژیوە و لە قورەکەی نەخولقاون. بە گوێرەی بنەماکانی مارکسی لینینی نیشتمانی کورد حەڵاڵی کۆمۆنستەکانی دنیایە لە هەر میللەتێک بن و ئەگەر کورد نەبنە کۆمۆنست یا نەکەونە ژێر کاریگەری زانستەکانی مارکسی لینینییەوە نیشتمانەکەیان لێ حەرامە.*

بە بەختم عەبدلڕەزاق محێدین ڕاستی گوتووە و کورد ئاوها لاوانی خۆی پەروەردە کردووە و کاریگەریتی ئەو پەروەردەیەش هەتا ئێستا بەردەوامە ئەگەرچی کوردە کۆمۆنستەکان خۆیان، تا ڕادەیەک گەڕاونەتەوە و ئێستا وەک هەر کوردێکی تر، یا زۆرینەی کورد کوردستانین. کاریگەری ئەو پەروەردە سەقەتە ئەمڕۆ لەوەدا دەبیندرێ کە کورد، لەگەڵ ئەوەشدا ئەنفال کراوە و تالان کراوە، کەچی دەرگای ماڵەکەی بۆ هەمان ئەو ئەنفالچی و تالانکەرانە والایە و بە بەرچاوەوە دەبینین پەنا دەدرێن بێ ئەوەی بزانین ڕابردوویان چۆنە، ئەوجا باوەڕ بە بەڵێنەکانیان دەکەین کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ و جار لە دوای جار دەستمان بە زاخدا دەکەن. حەیف کە مامۆستا مەسعوود محەمەد نەمایە ئێستا تا بە چاوی خۆی ئەو ئەنجامە ببینێ و بزانێ چۆن هەوڵەکانی بۆ دەستەمۆکردنی عارەب و بەبراکردنیان بەفیڕۆ چوون و جارێکی تر ئەو نووسینە داڕێژێتەوە! من ئەمە دەڵێم و بەرانبەر زاتی ئەو پیاوە گەورەیە شەرم دەمگرێ و زمانم گۆ ناکا، بەڵام بڵێم چی ئەو «برا»یانەی کە مامۆستا بەتەمابووە پشتی کورد بگرن چۆن هەزار جار دەستخەڕۆیان کردین و ئێمەش، نە کۆڵ دەدەین نە تەمێ دەبین و نە بە خۆماندا دەچینەوە!

ئەو چەند دێڕەی د. عەبدلڕەزاق محێدین کاریان کردۆتە سەر سۆزی مامۆستا و ئەویش هاتۆتە دەست. ڕاستە هەوڵی داوە برایەتی لە نێوان کورد و عارەبی قەومیدا بچەسپێ و برایانە پێکەوە بژێن و ویستوویەتی ماددەی سێیەمی دەستووری کاتی عیراق کە کوردی تێدا بۆتە شەریکەبەشی عارەب ببێتە دەستووری هەمیشەیی، بەڵام دێڕ بە دێڕی نووسینەکەی شانازییە بە کوردەوە و هەوڵدانە بۆ ئەوەی عارەبە قەومییەکان بە جۆرێ لە کورد بڕوانن وەک ئەوەی لە قەومەکەی خۆیان دەڕوانن.

مامۆستا لە لاپەڕەی ٣٣٥ی «گەشتی ژیانم»ی خۆیدا باسێکی جوانی ئەو نووسینانەی خۆی و خەڵکانی تری کردووە و من هەرچی لە بارەیەوە بڵێم، ڕەنگە چمکێکی ئەوەم پێ نەگوترێ کە خۆی لێی دەدوێ. جا با سەرنج بدەین تا بزانین چی دەفەرموێ:

*لە بەرەو کۆتایی بەهاری 1960 «د. عبدالرزاق محيی الدين» لە جەریدەی «الحرية»ی «قاسم حمودی» گوتارێکی بڵاو کردەوە ڕووی وتووێژی لە کوردی قەومی بوو، زۆریش پیاوانە و ئینسافکارانەی نووسیبوو لە بارەی کوردەوە. کەسانێک لە کوردان دەنگێکیان دایەوە بەڵام بایی مەبەستی نەدەکرد.*
*من گوتارێکم نووسی بەهێز و پێز و بە عەرەبیەکی وەها دەشێ بە بابەتێکی بێسابیقە بژمێردرێ. پازدە ڕۆژ ئەو گوتارەم لا مایەوە، هەندێک لە ڕابەرە زلەکانی حیزبەکەمان ئاگادار بوون لە نووسینی، ڕەنگە سەرێکیشیان بە پێشەکیانیدا گرتبێت. من نە قاسم حەموودی و نە عەبدورڕەزاق موحیددین. هیچ کامێکیانم نە دیتبوو چ جایی بیانناسم. پاش ئەو پازدە ڕۆژە بە دووجار هەوڵ دان ئنجا جێگەی جەریدەی «الثورة»*[1] *یان دۆزیەوە و گوتارەکەیان بۆ برد.*

---

[1] دیارە مامۆستا، مەبەستی جەریدەی *«الحرية»*یە، نەک سەورە.

لەو گوتارەدا کۆمەڵێک قسەی گرنگی سەر بە کوردایەتی و مافی نەتەوایەتی هەبوو بەڵام ڕەخنەیەکی ڕاست و دروستی تێدا بوو بەرانبەر خەتی مارکسایەتی کە لە ڕابەرایەتی حیزبەکەدا هەبوو. گوتارەکە بە دوو ئاڵقە لە ڕۆژانی دە و یازدەی تەمووز لە «الحرية»دا بڵاوکرایەوە. لە هەوەڵەوە چەند ڕۆژەک بە بێدەنگی بەسەر گوتارەکەدا تێپەڕی، بەڵام زۆری نەبرد ڕۆژنامەی حیزب هەڵرژا بە هێرشی سەیر و سەمەرە بۆ سەر من و عەبدولڕەزاق و ڕۆژنامەی «الحرية». پێی ناوێ برینان بکولێنمەوە، ئەوەندە دەڵێم ئەگەر دوارۆژم وەکوو ئەستێرەناس بخوێندبایەوە نووسینی توندوتیژترم بەکاردەهێنا.

لە کوشندەی ئاڵۆزانی نێوان حیزب و مندا جەریدەی حیزب بە تۆمەتی هەوڵ دان بۆ نانەوەی ئاژاوە و دووبەرەکی کە لە گوتارێکی بەدیکرابوو درایە عورفی دووەم. مەحکەمەی عورفی، سێ خەبیری هەڵبژارد: عەبدولڕەزاق موحیددین و مستەفا جەواد و مەسعوود محەمەد... سەرۆکی عورفی کە هەرگیز نەمدیتبوو تەلەفۆنی بۆ کردم، دوای موجامەلە لێی داوا کردم کە ئەو خەبیرییە ڕەفز نەکەم پێم گوت من ئۆتۆمبیلم نیە ناگەمە مەحکەمەتان. کابرا، ماڵی ئاوابێ، بەیانییەکەی ڕۆژی موحاکەمە خۆی هاتە شەریکەی موادی بینائی و منی گەیاندە شوینی لێ کۆبوونەوە. دەبێ بڵێم کە دیتمی سەیری هاتەوە چونکە دوای خوێندنەوەی نووسینە بەهێز و پێزەکەی من کە لە «الحرية» بڵاوکرابۆوە بە تەما بوو پیرەمێردێکی سمێڵ سپی دووکەڵاوی ببینێت کە قاڵ بووبێتەوە لە کتێبە پەڕزەردەکانی صرف و نحوی زەمانی قالوبەلایێ. پێم گەییشتەوە کە مام جەلال لە ڕۆژناماندا دانانی من و عەبدوڕڕەزاق موحیددینی بە خەبیر خوێندبۆوە گوتبووی جەریدەکەمان سەلامەت دەرچوو...

لە کۆبوونەوەدا کە د. عەبدوڕڕەزاق بە بەهانەی پیاسە نەختێکی دوور خستمەوە و گوتی د. مستەفا جەواد چی من و تۆ پەسەندی بکەین پێی ڕازییە چونکە تێکەڵ بە بێنە و بەرەی سیاسەت و

تێک چوونی نێوان حکومەت و حیزبەکان نەبووە... هەروا بەدەم قسەکانەوە و لەوپەڕی خاوێنییەوە گوتی خۆت دەزانی من بیروڕام بەرانبەر حکومەتی عەبدولکەریم چییە و چۆنە، بەڵام مەسەلەی خەبیری ئەمانەتە... ڕاستییەکەی من قسەم پێ بڕیەوە و گوتم فلان، ئەو خەڵقەی چاوی بڕیوەتە بڕیاری ئێمە بە تەما نییە لە ڕێی فەلسەفەی ڕووتەوە بۆ هەڵسەنگاندنی هەڵوەستمان بچێت. کە هاتین بڕیاری تاوانبار کردنی جەریدەمان دا یەکسەر بێ دوودڵی دەڵێن ئەم دووکەسە (واتە عەبدورڕەزاق و من) تۆڵەی خۆیان لە جەریدە دەستێننەوە و حکومەتیشی پێ ڕازی دەکەن... دەرحاڵ قسەکانی چووە دڵەوە. بڕیارمان بریتی بوو لە دوو دێڕی کورت بە پەڕاندنەوەی جەریدە لە تۆمەت.

پێشتر چەند جارێک لەگەڵ د. عەبدورڕەزاقدا دیدەنیمان لە یەکدی کردبوو. دوای دەرچوونی گوتاری ئەو و هی من و شریتەی گوتاران لە و لە من و لە خەڵقی دیکەشەوە. د. عەبدورڕەزاق هاتە سەردانم لە ئوتێل. مەرحووم تاهیر دەباغ بە شارەزایی لە گەڵیدا هات. د. عەبدولرڕەزاقیش وەکوو سەرۆکی عورفی لە هەندێ باری سەقافیمەوە بە سەهوو چوو بوو. دوای خۆشامەدی و چۆنی و چاکی گوتی وا پێدەچێ لە شێوازی عەبدولقەهاری جرجانی شارەزا بیت. گوتم باوەڕت هەبێت لە ناوەکەی نەبێ شارەزای هیچ شتێکی نیم. بەملا و بەولادا قسە ڕۆیشت هەتا هاتە سەر هێندێ کە بڵێ، قورئانت بە چاکی هەزم کردووە. گوتم ڕەنگە ڕاست بێ کە خەتمم نەکردوە. دوای قسەی ئەوتۆیی پێم گوت، لێم بە سەهوو مەچۆ، من پتر تێفکریوم لەوەی خوێندبێتمەوە ڕەنگە نەزانم حوکمی «حتی» لە ئیعرابدا چییە... - ئێستاش باشی نازانم.

دوای سێ ساڵ کە لە ئاهەنگەکانی وتووێژی سەر بە «لامەرکەزی» نیوەڕۆیەک لە ئوتێلی «بەغدا» داوەتکراوی فوئاد عارف بووین، پیاوێک هاتە ساڵۆنی داوەتەکە و من نەمدەناسی هەتا بە یەکتریان ناساندین کە من مەسعوود محەمەد و ئەو

*«قاسم حمودی» خاوەن ڕۆژنامەی «الحرية»یە، ئەندامە هەرە چالاکەکەی کۆنە حیزبەکەم چاوی کرایەوە و گوتی، بۆچی ئێوە یەکترتان نەدیوە؟ ئەمەی پرسی چونکە لەو نووسینانەی 1960 کە هێرشی دەهێنامە سەرێ وەهای دەردەبڕی کە لەگەڵ د. عەبدوڕڕەزاق و خاوەنی «الحرية»دا پلانگێڕی دژی کوردایەتی و عەرەبایەتی و هەموو شتەکایەتیەک دەکەین... ئەمانە هەموو بوونە خەون و وڕێنە، ئێمە کوڕی ئەم ڕۆژەی 1988/02/25ین کە ئەم دێڕانەی تێدا دەنووسم.*

هیوادارم بەم وەرگێڕانە خزمەتێکم بە کتێبخانەی کوردی کردبێ و گیانی پاکی مامۆستا مەسعوود محەمەدم لێ ڕازی بێ ئەگەرچی ناکرێ وەرگێڕانی ئەو عارەبییەی مامۆستا بێهەڵە بێ.

حەکیم کاکەوەیس
حەساری گەورە، کەرکووک، کوردستان 2012/12/01

## له پێناوی پتەوکردنی برایەتی عارەب و کورددا[2]

نووسینی هۆشیار (مەسعوود محەمەد)

و: حەکیم کاکەوەیس

حەساری گەورە/ کەرکووک / کوردستان 2013

[2] یەکەم گوتاری ئەم سێ گوتارەی مامۆستا مەسعوود محەمەد 10ی تەمموزی 1960 لە ڕۆژنامەی «الحرية»دا بەنازناوی «هوشيار»ەوە بڵاو کراوەتەوە.

بەڕێز، جەنابی دکتۆر عەبدلڕەزاق محیّدین

ڕێز و سڵاو. ئەوجا، ئەگەر کوردێکی نیشتمانپەروەری خاوەن هەستی نەتەوەیی هاشا لەوە بکات کە کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەوەی لە زنجیرە نووسینەکەتدا لە بارەی گەلی کوردەوە نووسیوتە و لە «الحرية»دا بڵاوت کردۆتەوە، لێی دەبێتە لووتبەرزییەکی ناشرین، چونکە لە ئەنجامی ئەوانەی کە ڕوویانداوە دەبێ بڵێین میللەتێک مافی خورابێ و دەنگی بڕابێ، بە ئارەزووی بیابانێکەوە کە لە گەرمای هاویندا دڵۆپە ئاوێک هەڵدەمژێ، وشەی دڵگەورەیی و پشتگیریکردن لە بنەچە و سەرچاوە دەقۆزێتەوە و لە توێی ڕووحیدا دەیپارێزێ. وشەکەی تۆش لە پشتگیری زیاتر بوو و لە دڵگەورەییش زیاتر بوو، چونکە کاتێ بە تان و پۆی تایبەتمەندییەکانی کورددا چوویتە و باسی مافەکانی ژیانی سەربەرزانەیت وەک هەر میللەتێکی تر کردووە مەبەستت پێکاوە. لە ڕاستیدا لە گوتەکەتدا تا ئەو ئاستە ڕاشکاو و بەویژدان بوویت کە خەڵکی تر، بە تایبەتی کورد وا لێ بکەیت لە باسکردنی ئەم بابەتەدا لەگەڵتدا وەک خۆت قسەڕوون بێ و لە ڕێی قسەکانی تۆشەوە لەگەڵ خوێنەری عارەبیشدا قسەڕوون بێ.

گەلی کورد، وەک لە لای کەسێکی شارەزای وەک ئێوە ئاشکرایە، بە بارودۆخێکی مێژوویی وەها دەورە دراوە، مێژووی مرۆڤایەتی ناتوانێ یەک نموونەی تری لێ بهێنێتەوە، چونکە کورد کراوەتە چوار پارچە یا زیاترەوە و وڵاتانی دنیا و وڵاتانی ناوچەی دابەشکردنەکەش بە گەلەکۆمەکێ کاریان بۆ بەردەوامی ئەو دابەشبوونە کردووە و یاسایان بۆ هەمیشەیی و شەرعییەت پێدانی داناوە و هاوکاری و هاوپەیمانییان لە سەری کردووە و ئەگەر لە توانای ئەو دەوڵەتانە بەدەر بووبێ گەلی کورد کۆت و زنجیر بکەن و مەودای ببڕن بۆ ئەوەی هەموو بزاوتنێکی ڕەت بکەنەوە، لە مەودای قەومییەتی بەرتەسکدا، بۆی هەیە ئەو بێزارییەی ئەم گەلەی تێئاخێنراوە لەگەڵ هەر خۆبزواندنێکی بێزاریدا، دەمی تیغ و نووکی تیژی سوپای ئامادەکراو بۆ هێشتنەوەی ئەو دابەشبوونە بە گۆشتیدا بچێ جا نرخەکەی هەرچەند خوێن

و بەربەستکردنی ئازادیی کورد و قوربانیدانی بێ. ئەگەر قوربانییەکانی گەلی کورد لەو بوارەدا بژمێریت، لە ژماردن ماندوو دەبیت و پێویستە بە چاوی نوقاوەوە باوەڕ بکەی هەستی کورد بە ئازاری کارەساتێک بە سەر منداڵیاندا دێ و چەوساندنەوەیەک بە سەر کەسوکار و نیشتمان و ئازادییاندا دەبارێ، بە قەدەر ئازاری ئەو عارەبەیە کە بە هۆی ئەو قەسابخانە و زوڵمانەوە دەیچێژێ کە بە دەستی دوژمنی عارەب، لە مێژووی کۆن و نوێدا بە سەریدا هاتووە. هەستکردنی کورد نەمردووە تا بە هۆی دابەشبوون و کوشتوبڕەوە ئازاری نەبێ لە کاتێکدا عارەب، گوێی دنیا بە دەربڕینی نارەزایی لە دابەشبوون و زوڵم، بە تێکۆشان بۆ یەکگرتنەوە کەڕ دەکا و جیاوازی کورد و عارەب لەم بوارەدا هەر ئەوەیە کە عارەب چەندین حکوومەت و دەیان ئێزگە و سەدان ڕۆژنامە و یەک جەماوەر پیاوی دیپلۆماتکار و سیاسەتمەداری ڕەسمی و نارەسمییان هەیە و لە نێودەوڵەتاندا و لە هەر دەوڵەتێکیش بە جیا، کە بەرژەوەندی عارەب بخوازێ، نوێنەرایەتییان دەکەن و بە هەزار و یەک زمان باسیان دەکەن و بەوپەڕی ڕوونی، کە لەوە ڕوونتر نابێ، دەیانبیستن و ئەگەر نیشتمانپەروەرێکیان لە هەر پەنایەکی دنیا بکەوێتە تەنگژەوە، لە دەیان وڵاتەوە سینگ و ئامێز بۆ لە باوەشگرتن و بەخێرهاتنی دەکرێنەوە و ئەگەر شێرەژنێکیان، جەمیلە، لە جەزائیر ئازار بدرێ حکوومەتە عارەبییەکان لە پێش گەلە عارەبییەکانەوە ڕادەپەڕن و بە سندان لە جێی قوززەڵقورت، بە بڕینی پەیوەندی سیاسی یا ئابووری یا بە بزووتنەوەی چەکداری ئەگەر پێویست بێ، بەرپەرچ دەدەنەوە و هەموو ئەوانە بۆ عارەب هەن و جێی خۆشحاڵی هەموو مرۆڤێکی بەویژدانی شەرەفمەندی عارەب و ناعارەبە و لەوەش زیاتریان شایستەیە بەڵام کەس لە عارەب و ناعارەبی پرسیوە ئاخۆ بارودۆخی کورد چۆنە؟

کاتێ دەڵێم کورد بە بەردەوامی پێچەوانەی هەموو ئەوانەیان هەیە، زانیاریت زیاد ناکەم چونکە خۆت ئاگاداریت. کورد، جگە لە چەند ڕۆژنامەیەک کە بە پەنجەی دەستێک دەژمێردرێن و بە هۆی گەورەیی مەسەلەکە و مەترسی

هەڵوێستەوە بە سەر خۆیاندا کروشکەیان کردووە، زمانێکیان نییە بە ناویانەوە قسە بکات. جگە لە ڕۆژنامەی «خەبات»ی زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان کە دەستبەرداری زمانی خۆی بووە و بە عارەبی دەنووسێ بەشکم ئەوە خوایە دیدی خوێنەرێکی ناکورد بخزێتە سەر دێڕەکانی و دیتنی ناوی قەومێکی نائاشنا بە چاو و گوێ و زاری، کە ناوی گەلی کوردە، برژانگی بلەرزێنێ، هیچ ڕۆژنامەیەکی کوردی نییە خەسڵەتی یاسایی هەبێ. لەو تێنوێتییەم ببورە کە هەستی ئازار بۆیم دەبا جا «خەبات» لە باسی چارەسەری کاروباری کورددا یا لە شێوازی چارەسەردا بیپێکی یا نەیپێکی، هەرچۆنێ بێ خەریکی حەلکردنی مەسەلەیەکی بیرکارییە بە چەندین نەزاندراوی بن ڕەگی دەجار و بیست جارەوە و لەمەشدا مەبەستم هێنانەوەی بیانوو نییە بۆ هەڵەیەکی «خەبات» یا غەیری خەبات ئەنجامی دەدا چونکە دوای پێکانی ڕاستی هیچ ئامانجێک بۆ ئەو کەسە نامێنێ بە دوای ڕاستیدا دەگەڕێ یا خاوەنی مەسەلەیەکە، بەڵام من هەر بۆ ڕوونکردنەوە باسی جیاوازییەکە دەکەم. کورد جگە لە بەشی کوردی ئێزگەیەکی عیراقی کە هەندێ جار ئافاتی گیانی گەلی کورد و کەرەسەی بریندارکردنی هەستی نەتەوەیی کورد بووە، ڕادیۆیەکی نییە بە ناویەوە قسان بکا. بەڵام پیاو حەق بڵێ، جگە لەو ماوە ڕەشانە ئێزگەکە بۆ حیسابی کورد، چ قازانج و چ زەرەر کاری کردووە و لە ئێرانیش نەک یەک بەڵکو چەند ئێزگەیەکی کوردی هەن بەڵام لە بنەمادا بۆ بەرژەوەندیگەلێ لەکاردان کە چ پەیوەندییان بە بەرژەوەندی کوردەوە نییە. کورد نەک هەر حکوومەتی نییە، بەڵکو جگە لە پارتی دیموکراتی کوردستان لە عیراق و هەندێ ڕێکخراوی خوێندکاران لە ئەورووپا هیچ دامودەزگایەکی ڕەسمیشی نییە. کورتەی قسان، ئەگەر هاشا لە بوونی نوێنەری ڕەسمی کوردی نێونەتەوەیی بکەین، لق لە ئەسڵ دروست دەبێ و ئەسڵیش نییە تا لقێکی لێ دروست بێ و گەڵا دەربکا. کورد، دکتۆر، وەک دەزانی بە کێشە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی دەوری خۆی و بارودۆخەکەیەوە گەلێکی بێوێنەی مێژووە و خەسڵەت و تایبەتمەندی خۆی

هەیە و لە میحرابەکەی بە ڕوونی نووسراوە «گەلی لێقەوماوی ژمارە 1» و دیدی هیچ چاوێک نایبوێرێ. کورد لە ڕیزی هەموو میللەتانی دنیادا، جگە لە بارودۆخەکەی، بە هیچ شێوەیەک لە هیچ شتێکدا تایبەتمەندێتی نییە. ئەگەر کوردێک دەنگی هەڵبڕێ – هەر بە قسە و واز لە کرداریش بێنە – سوپا و دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی لێ تیژ دەبن و ناڵە لە ناخیدا دەتاسێنن و ڕێنادەن هەناسەی دوای هەناسەدان هەڵمژێتەوە و ئەگەر فرمێسکێک لە چاوی ژنە کوردێک بۆ کیژۆڵەیەکی غەدرلێکراو داباریێ، بۆ جێبەجێکردنی یاسا و دەستووری بە پیرۆزکراو سونگی چاوی دەردێنێ و شیوەن لە کوردستاندا بۆ کارەساتە نەتەوەییەکان، لە پشت پەردە و پەرژینەوە نەبێ نییە و پەردە و پەرژینیش لە سزا دەرباز نابن. کارەساتی کورد لە چارەنووسیاندا هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ بزرە و لە بزربوونی شتە بێواتاکان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بزرترە. مێژووی کورد و تێکۆشان و شۆڕشیان و داستانی قارەمانانیان، ئەگەر بزریش نەبن قەڵەمی ساختەکاری بە سەریاندا دێ و شۆڕشەکانیان دەکاتە فیتنە و قارەمانێتییان دەکاتە شێتایەتی و قارەمانیان دەکاتە خائینگەلێک کە دادپەروەری سزای دابن.

ئەمە، وەک دەزانی کورتەی بارودۆخی کوردە لە نیشتمانی خۆیدا، کە لێی دەرکراوە جگە لە عیراق کە هاوسۆزیی نێوان عارەب و کورد لە قووڵایی مێژووەوە دیاردەیەکی بۆماوەییە و شۆڕشیش لەم هاوسۆزییەوە، بە دیارکردنی خەتەکانی و ڕوونبوونی سیمای و تۆخکردنی ڕەنگ و سێبەرەکانیەوە بەرپا بوو. درێژەی نادەمێ نەک وا لێکبدرێتەوە شەفاعەتێک بێ بۆ قسەلەڕوویی و ڕوونی مەبەست. جگە لەوەش قسەکردن لە بابەتێک کە تۆ مەترسییەکەیت بەیان کردووە دەبێ لە سەرووی گومانەوە بێ وەک کە دەبێ لە سەرووی تەمومژ و هەڵەیشەوە بێ.

ئەگەر نووسەر بەو شێوەیەی لە سەرەوە باس کرا شارەزایی لە ڕاستیی بارودۆخی گەلی کورد هەبێ، ڕێی هەیە باسی هەڵوێستی حیزبە قەومییەکانی خۆی بکا کە دەبێ چۆن بێ و پێویست بە هێنانەوەی بەڵگەش ناکا کە حیزبی

نەتەوەیی کورد لە سنووری گوتارەکەتدا تەنها لە سەر پارتی دیموکراتی کوردستان دەچەسپێ چونکە کورد لە عیراقدا حیزب و ڕێکخراوی تری نییە.

دکتۆر، ئەوەی دەڵێی کە مەحاڵە نەتەوایەتی و مارکسێتی لە یەک حیزبدا کۆ بکرێنەوە، شتێکە کەسێ ئەم دوو خەسڵەتەی هەبێ بەرپەرچت ناداتەوە: «تێگەیشتن» و «ڕاستگۆیی» ئەوەش ڕاستییەکە و تیایدا، کۆمۆنستەکان بەر لە هەر کەسێکی تر لەگەڵتدا هاوڕان و لەوەش زیاتر دەڕۆن کە ململانێی هەر کەس و حیزبێک دەکەن لەگەڵیاندا نەتویێتەوە و مارکسیزم و نەتەوایەتی پێکەوە کۆبکاتەوە یا مارکسیزم بخاتە سەر مەزەبێکی تر، تەنانەت بە هۆی سووربوونیانەوە لە سەر تاپۆکردنی مارکسیزم لە سەر خۆیان باوەڕیان وایە هەر حیزبێکی ناکۆمۆنست پەیڕەوی مارکسیزم بکات جۆرێکە لە دزیکردن و ڕێیەکە بۆ دزەکردنی جاسووس بۆ ڕیزی پرۆلیتار، ئەوەش بۆ لاوازکردنی تێکۆشانی و پیسکردنی باوەڕەکەی بە بیری هاوردە و دەبێتە بەربەست لە بەردەم ڕێڕەوی چینایەتی ڕاستەقینە لە دنیای کۆمۆنیزمدا و ئەمەش بەڵگەنەویستە و لە هەموو سەرچاوەیەکی کۆمۆنیزم و ڕەفتاری هەموو کۆمۆنستە ناوچەییەکان و تەنانەت هەڵویستی دەوڵەتە دیموکراتییە گەلێرییەکان و کۆمۆنستییەکان و کۆبوونەوەی حیزبە کۆمۆنستە جیهانییەکانیشدا بە زیادەوە هەیە و پێشتر نەبووە حیزبێکی ناکۆمۆنستی لە ڕیزی حیزبە کۆمۆنستییەکاندا وەربگیرێ و خۆماندوکردنێکی بێهوودەیە ئەگەر حیزبێک بیەوێ باوەڕ بە ئومەمییەت بێنێ دەستبەرداری ئەو خەسڵەتە بێ کە بۆ خۆی هەڵیبژاردووە و بە درێژایی مێژوو لە سەری ڕۆیشتووە چونکە ئەوە داوکارییە لە شتێک پێچەوانەی خەسڵەتی خۆی ڕەفتار بکا و ئەگەر ئەوەش وا بێ حیزبێک لە ڕووی نێونەتەوەییەوە وەک مارکسی دانی پێدا نەنرابێ و دروشمەکانی بەرز بکاتەوە وەک ئەوەیە دەسەڵات بە لایەنێک درابێ کە خاوەنی ڕاستەقینەی مارکسیزم نەبێ، ئەوانیش کۆمۆنستەکانن وەک حیزب و ڕێکخراو و دەوڵەت، پێشەکیش بزانن کە حوکمی هەڵوەشانەوە دەدا نەک سەپاندنی. هیچ حیزبێک ئەگەر خۆی بە مارکسی بزانێ یا نوسخەی دووەمی

حیزبێکی شیوعی بێ ڕێی نییە تەمای بە چاوپۆشیکردنی حیزبی شیوعییەکان بێ چونکێ تێکەڵاوبوون لەگەڵ جیهانی کۆمۆنیزمدا یا ڕۆیشتن بە ڕێگەیدا بە مەرسووم نەبێ یا بە دانپێدانانی ئاشکرا نەبێ کە دەستبەرداری مارکسیزم نابێ، ناکرێ و لە عیراقدا، حیزبە شیوعییە ڕەسمییەکەی نموونەیەکی زندووی هەموو ئەوانەیە کە هیچ ناو و بۆچوونێکی ئاشکرای ناوچەیی و جیهانی نییە لە دوژمنایەتیدا نەکەوتبێتە سەرووی هەموو دوژمنایەتییەکی ڕاگەیەندراو یا نهێنییەوە. بە کورتییەکەی، بە پێی هەڵسەنگاندنی بەرچاوڕوونترین خەڵک، بە مارکسی بوونێک لەگەڵ ڕێچکەی ئاسایی و مێژوویی مارکسیزمدا یەک نەبێ، هەوڵێکی نەزۆک و ناڕاست و بێبەرهەمە، بەڵام شەرعییەتی بوونی «لاساییکەرەوە» لە سەر ئیجتیهادی بەلاشی خەڵکانی تر دەوەستێ کە وەک لایەنگری و ئاماژەپێدان و هاندان بە دەستی دێنن.

لە سەر ناتەبایی فەلسەفی نێوان نەتەوایەتی و کۆمۆنیزمەوە و لە سەر مەحاڵبوونی کۆکرنەوەیاندا لە یەک بونیادی حیزبیشدا، ناتەباییەک، نەک هەر لە نێوان پەیرەوی نێونەتەوەیی و پێڕەوی نەتەوەییدا هەیە، بەڵکو بە شێوەیەکی گشتی، ئەو ناتەباییەی لەگەڵ هەموو پەیڕەوێکی سیاسی تریشدا هەیە. چونکە حیزبێک پەیڕەوی ڕێبازی نێونەتەوەیی بکا، هەر کاتێ بەرژەوەندی نێونەتەوەیی بخوازێ، دەستبەرداری ئەو ئامانجە دەبێ کە لە بنەڕەتدا لە پێناویدا دروست بووە، ئەوەش لە سەر بنەمای قوربانیدان بە بەش لە پێناوی گشتدا، وەک مارکسییەکان دەڵێن. لەگەڵ باوەڕهێنانیش بە ئاسۆی بەرین و مەیدانی فرەوانی ئەم بنەمایەدا، جێبەجێکردنی لە سەر خەباتی میللەتێکی دابەشکراوی وەکو کورد، بە هەر پێوانەیەک بێ ئەنجامێکی پێچەوانەی دەبێ و هەر لۆژیکێک ڕاستییەکان سەرەونخوون نەکاتەوە ڕەتی دەکاتەوە چونکە کورد لە خەباتی خۆیدا پێویستی بە چەندان و چەندان ئەو توانایە هەیە کە هەیەتی و پێویستی بە هەر میقدارە لایەنگرییەکی ماددی و مەعنەوی هەیە و دەبێ بە پێی ئەو بۆچوونە دەسبەرداری ئەو کەمەی خۆی بێ کە هەیەتی و بیبەخشێتە میللەتێکی هەزار ملیۆنی کە ئەوەندە توانای

هەیە باس ناکرێ و ئەگەر کورد هەرچی هەیە بیداتێ پێی زیاد ناکا و ئەوجا فرسەتی ئەوەشی نابێ بە هۆی ئەو هاوکارییە کەمەوە سوپاسێک بکرێ. سواڵکەرێک دەستکەوتی ڕۆژێکی سواڵکردنی خۆی دەخاتە سەر سامانی ملیۆنێرێک و لە بەرانبەریشدا، نە سوپاس دەکرێ نە خەڵات دەکرێ چونکە ئەوە فەرزە و سەپاوە و بۆ بەخشینی دەستخۆشی لێ ناکرێ و نەبەخشینی سزا و کافربوونی بە دواوەیە.

شێوازی مارکسیزمی نێونەتەوەیی خەسڵەتی تایبەتی (نیشانەی جیاکەرەوە)ی هەیە کە وا دەکا ناتەبایی نێوان خۆی و تێکۆشانی نەتەوەیی ببێتە شتێکی سەپاو و بەوەش خەباتی چینایەتی دەکاتە شێوازی کارکردن و ڕێبازی بەرپابوونی شۆڕشی پرۆلیتاری لە دژی چینەکانی تر، تا لە هەر ولاتێکدابێ دەسەڵات بداتە دەستی پارتی کۆمۆنست و لێرەوە بانگەوازی «کرێکار و وەرزێر و کاسبکار و ڕۆشنبیر» بەرز دەبێتەوە چونکە ئەمە بۆ جیاکاری و ئامادەکاری شەڕی چینایەتییە و بە دەوری تەوەری «کرێکارانی جیهان یەک بگرن»دا دەخولێتەوە و چەندی بکرێ ڕەشورووتی خەڵکی بۆ ڕادەکێشێ و «وەرزێر و کاسبکار و ڕۆشنبیر» بۆ ناخی دروشمە مێژووییە ناوبراوەکە زیاد دەکا.

حیزبی نەتەوەییش، بە تایبەتی لە ناو گەلێکی لاوازی دابەشکراوی وەک کورددا، ئەگەر ئەو دروشمەی دووپات کردەوە و ئامادەکاری بۆ شەڕی چینایەتی کرد، بە پێچەوانەی ئەرکی مێژوویی سەر شانی خۆی ڕەفتار دەکا چونکە خەباتی نەتەوەیی کە ئامانجی بەدەستهێنانەوەی مافەکانی گەلێک بێ، نەک یەکێ لە چینەکانی، پێویستی بە توانای سەرجەمی ڕۆڵەکانی ئەو گەلە هەیە بە یەکگرتوویی و یەکڕیزی و لە بارودۆخی کورددا توانای دار و بەرد و هەرچی بە ئاسماندا دەفڕێ و چی بە سەر زەویدا دەخشێ پێویستە چجای ڕیزیان دابەش بێ و ئامانجیان پێچەوانە بێ و ببن بە شەڕ بە سەر یەکەوە و بە شەڕی ناوخۆوە سەرقاڵ بن نەک کاروباری تر؟ ئەو خەڵکانەی لە ناوخۆدا پێکدا دەدەن بە کەڵکی ئەوە نایەن ببنە سەربازی شەڕی نەتەوەیی بەڵکو

ماددەی خاون و بۆ ئەوە ئامادەن پارتی کۆمۆنست وەک کەرەسە بەکاریان بێنێ. ئەوەشی بانگەواز بۆ شەڕی چینایەتی دەکا، بیەوێ یا نەیەوێ کۆمۆنستە و دژی نەتەوایەتییە و بیەوێ یا نەیەوێ بورغوویەکە بە مەکینەی کۆمۆنزمی جیهانییەوە. لێرەدا مەودای باسکردنی گونجاندنی خەباتی نەتەوایەتی و بەرژەوەندی چینە هەزارەکان نییە چونکە باسی ناتەبایی مارکسیزم و نەتەوایەتی دەکەین و بە دوای باسکردنی شتی ئەودیوی ئەوەدا ناڕۆین.

لەم بواری فکری و باوەڕدارییەدا، کە خۆبەخۆ لە ژیانی ڕۆژانەدا دەبن بە هەڵوێستی کارا، بۆچوونی نیشتمانپەروەرانی کورد لە پەنابردن بۆ مارکسیزم بۆ کاری سیاسی، جیاوازە و لە ڕووی ڕوونییەوە نەک بەڵگەهێنانەوە، پێدەچێ خەسڵەتی زاڵی فکر و فەلسەفەی زۆرینەی سەرانی پارتی دیموکراتی کوردستان بۆچوونی نێونەتەوەیی مارکسی بێ و ڕەواج بە مارکسیزم دەدەن و هەوڵیش دەدەن لەگەڵ بارودۆخی واقیعدا بیگونجێنن و بە پێی زانیاری من، زۆرینەی جەماوەری ئەو حیزبەش لەگەڵ ئەو ڕێبازەدا نین. ئەوانە بیانووی وەها دەهێننەوە کە پێشوەخت پەیوەندیدارە و دەڵێن ئەو ڕۆژەی دادپەروەری سۆسیالیزم لە جیهاندا باڵادەست دەبێ مافی هەموو مافخوراوان دەدرێتەوە. ئەوەش بە باوەڕی من، قسەیەکە، بە شێوەیەکی گشتی بۆ ئەوە باشە دوژمنانی گەلی کورد و کوردە ناحەزە کۆمۆنستەکانی ڕازی بکا چونکە بۆ ئەوانەی لە دابەشکردنی کوردستان سوودمەندن، لەوە ئاسوودەبەخشتر نییە باسی چارەنووسی کورد بۆ لۆچە نەزاندراوەکانی داهاتوویەک دوا بخرێ کە ڕێی تێدەچێ لە بەدیهێنانی ئاواتەکانیان زیاتر بخایەنێ. من ناڵێم ئەوە قسەی ئاشکرای سەرکردە مارکسییەکانی پارتی کوردستانییە بەڵام ئەنجامی بێ ئەملاوئەولای گرێدانی چارەنووسی کورد بە شتێکەوە کە پێی دەڵێن مەسەلەی گەلان، ئەنجامگیرییەکی حەتمییە کە ڕەفتاری سیاسی دەبێتە شەڕی چینایەتی. بەڵگەنەویستێکی ڕوونیشە کە تێکەڵکردنی مەسەلەی کورد بە دنیای نێونەتەوەییەوە، بزرکردنی درەوشانەوەیەتی لە پێناوی بەرژەوەندی نێونەتەوەییدا.

بەڵام من نیەتی سەرکردایەتی پارتی کوردستانی لەو هەڵوێستەیاندا کە هەڵیانبژاردووە تۆمەتبار ناکەم و پێم وابێ بە جۆرێ تێکۆشاون گەشەکردنی ڕۆشنبیرییان لە قوتابخانە مارکسییەکاندا، هەر لە دروستبوونیانەوە ناچاری کردوون تا ئەم دواییانە لە بارودۆخی بابەتیدا کە تیایدا چاوەڕوانی دەرفەت بوون کاری نهێنی بکەن، چاوەڕوانیشیان لە کامپی بەرانبەر ئەو کامپە بوو کە بە نهێنی و ئاشکرا ڕەتی کردوونەتەوە. ئەمڕۆش بەڵگەی ڕاستی هەڵوێستەکانیان دەخەنە بەردەست کە دەرگاکانی کامپی ڕۆژاوا و ئەو وڵاتانەی کوردستانیان دابەشکردووە و هاوپەیمانیانن، داخراون. زۆربەی گەنجە ڕۆشنبیرەکانی کورد لەوەدا هاوڕایان نین کە گریمانەی هاتنی هاوکاری لە کامپی سۆسیالیتییەوە ڕاست بێ و ئەو گریمانەیە هەتا ئەم چرکەساتە بەڵگەی کردەیی نەبووە. لەو ئەنجامگیرییەش لەگەڵیاندا نین کە پێی گەیشتوون و ئەم ناحاڵیبوونە بایی ئەوە نییە مەسەلەی کورد بۆ ئومەمییەت بکرێتە بەرانی قوربانی دەنا بەرژەوەندی کورد لە کوێی ئەم لێکدانەوە و بیانووانەدایە ئەگەر لە هەموو بارێکدا کورد بەرانی قوربانی بێ؟ لەگەڵ ئەو ئاڕاستەیەی سەرانی حیزبیشدا کە باس کرا، بۆ کوردێک ئاسان نییە بەرانبەر گەلەکەی و نیشتمانەکەی درک بە بەرپرسیارەتی مێژوویی و ئەرکی نیشتمانی بکا، جەستەی حیزبەکە ماندوو بکا یا لێی بقرتێنێ، چونکە لە ڕووی ڕووخاندنەوە کە بیناکردنەوەی بە دوادا نایێ، بۆ ئەوەش مەچۆ دوو حیزبی کوردی لە عیراقدا دروست بن، لەبەر ئەوە، وێرانکەری پارتی کوردستانی لە نەمان بەولاوە هیچی دیکەی بۆ نامێنێ و ئەوەش خراپەکارییەکی گەورەیە بە کورد دەکرێ و لەوە گەورەتر نابێ. ڕێی خۆدزینەوەی فرەوانیش بۆ خۆدەربازکردن لە خۆرەلێدان و سووکایەتی و وێرانکاری هەیە ئەوەش بە ڕەخنەگرتن لە سەرانی حیزبەکە و هەوڵدانی دەستەجەمعی بۆ ناچارکردنیان بۆ دەستبەردان لە هەڵوێستی خۆیان.

دەرگایەکی تریش بۆ گۆڕینی سیاسەتی سەرکردەکان هەیە، ئەوەش وەک باس کرا ئەوەیە بۆچوونی زۆرینەی هەرە زۆری ئەندامانی خوارەوەی حیزب

نەتەوەییەکی بێگەردە و ئەگەر حیزب لە سەر ڕێڕەوی ئاسایی خۆی بڕوا، ئەوانەی باوەڕی زۆرینەیان هەیە دەگەنە سەرکردایەتی و ئەوەش بۆ کەسێ سەرنجی ڕێڕەوی ڕووداوەکانی دابێ دوور نییە. ڕەنگە بەم باسە درێژەی پارتی کوردستانی سنووری خۆمم بەزاندبێ، چونکە تیایدا ئەندام نیم بەڵام چارم نییە چونکە باسی ئەو حیزبە کرۆکی ئەو نووسینەتە کە یەکەم جار بەرەو نووسین بزواندمی و بۆ دەستنیشانکردنی باوەڕی خۆشم لە سەر ئەو نەهجەی کە دەبێ خەباتی حیزبەکە لە سەری بڕوا دەڵێم و باشترین نموونە کە لەم بوارەدا ڕەچاو بکرێ قسەیەکی زەعیم عەبدولکەریم قاسمە کە لە بۆنەیەکدا شتێکی لەم بابەتەی گوت «من پیاوێکی سەرافم و بە دوای بەرژەوەندی وڵاتەوەم» ئەرکی ئەو حیزبەشە کە پێشرەوایەتی خەباتی سەرجەمی گەلێک دەکا ئەوەیە سەراف بێ و بە دوای زۆرترین سوودەوە بێ بۆ گەلەکەی و پێویستە گەلانیش بەوە ڕازی بن ئەگەر دیتیان ئەو موعامەلەیە لەگەڵ بەرژەوەندی خۆیاندا یەک نایاتەوە. ئەوان، ئەگەر بیانەوێ ململانێی نێوان گەلان لابەرن، هەڵوێستی خۆیان دەگۆڕن، بەڵام حیزبێک لە پێناوی بەرژەوەندی نێونەتەوەییدا موعامەلەی گەلی خۆی بەو نیازە وەلانێ کە دوای زەمانێ تۆڵەی بۆ دەکریتەوە، ئەوە شتێکە لە گەڵ لۆژیکی بوونی حیزبێکدا نایەتەوە کە خۆی بە پارێزەری بەرژەوەندییەکانی ئەو گەلە بزانێ و بێ ئەوەی بە هیچ جۆرێ سەرنجی شتی تر بدا، لەگەڵ بەرژەوەندییە نێونەتەوایەتییەکاندا ڕێک دێ. هەر گەلێک دوای سەرکەوتنی ئوممەمییەت لە چارەسەری کێشەی گەلاندا، بە مافە نەتەوەییەکانی خۆی بگا، بە پێی ئیددیعا و بۆچوونی کۆمۆنستەکان هەر لە ئێستاوە پێویست بە حیزبی قەومی نییە کە هەمان دیدی هەیە و لە ڕۆژی مەوعووددا کە حیزبێکی کۆمۆنست دەسەڵات وەردەگرێ، یەکەم ئەرکی ئەوە دەبێ ئەو حیزبە قەومییە لابەرێ تا بوونی نەمێنێ. سەرەتایەکی سەیرە و بەرەو کۆتاییەکی پێکەنیناوەر دەڕوا و ئەگەر دەستم بڕۆیشتبا بە درشتترین خەت لە خەباتدا ئەم ڕستەیەم دەنووسی:

«گەلی کورد باوەڕی بە خۆی و مافەکانی خۆی هەیە و بە قەدەر ئەو ڕێزە ڕێزی گەلان دەگرێ کە ڕێزی لێ دەگیرێ».

ئیتر لە بارەی ئەووەوە فەلسەفە و مەزەبەکان چی دەڵێن با بڵێن. ئەو فەلسەفەیەی شەرم لەوە دەکا فەتوای ئەوە بدا کە مافی سروشتی هەر گەلێکە لە هەڵبژاردنی شێوەی ژیانی خۆیدا سەرپشک بێ و مەرج و بیانووی بۆ بدۆزێتەوە، لە باشترین باردا فەلسەفەیەکە پێویستی بە چاککردن هەیە، دەنا دەبێ ڕاست بکرێتەوە. ئەوە دەڵێم و بەر لەوەی بگەمە قسەکردن لە سەر شۆڤێنیزم یا نەتەوایەتی دوژمنخوازانە، دەتوانم شتی زیاتر بڵێم، چونکە میللەتی مافخوراو و دابەشکراو داوای نەکردووە بچەوسێتەوە یا دابەش بکرێ تا ئەگەر داوای لابردنی چەوساندنەوەی کرد پێی بڵێن: بوەستە تۆ پێچەوانەی خۆتیت و بەڵگەت بە دەستەوە دا. ئەگەر ماڵێک داگیر بکرێ و خاوەنماڵ بە داگیرکەر بڵێ ئەی داگیرکەر ماڵەکەم چۆڵ بکە، نابێتە ئەو دەستدرێژیکەرەی خەسڵەتەکانی شۆڤینییەتی تێدا بێ. ئەگەر قسەکردنی بۆ دەرکردنی داگیرکەرەکە تێپەڕاند و کردی بە کردار، شایستەی نەفرەتی مێژوو و تووڕەبوونی فەلسەفەکان نابێ، بەڵکو بەوەی بە ماڵ و ژیانی خۆی هەوڵی وەرگرتنەوەی مافی خۆی دەدا، پارچە فوخارێک دەخاتە سەر تۆماری مێژوویی خۆی و بەڵگەیەک دەخاتە بەردەستی فەلسەفەکان تا وزەی لێ وەرگرن و بە لاپەڕەکانییەوە ببنە بەڵگەی ڕاستی بابەتەکانی. ئەگەر مێژوو هاشای لە چاکەکانیشی کرد و بیری فەلسەفە بە ڕووی هۆش و هەستدا تەماوی بوو، با بە ڕووی ڕەشەوە کە گەورەیی ڕاستگۆیی لێ سڕاوەتەوە لە دنیای بەدبەختەکان و زوڵملێکراوان دوور کەونەوە.

گوتم و دووبارەی دەکەمەوە کە زۆرینەی جەماوەری پارتی کوردستان نەتەوەیی بێگەردن و جەماوەرێکی زۆری ڕۆشنبیرانی بێلایەنیش بە دوایانەوەن و دەستیان دەگرن و بە دووری نازانم سەرکردەکانی حیزب بە تەواوەتی ڕێبازی سیاسی لەگەڵ زۆرینەدا ڕێکبخەن دەنا دەسەڵات لە دەست دەدەن و دەبنە سەرکردەی بێ سەرباز و گرنگی کاتیش کەم ناکەمەوە

چونکە کاروبار لە دنیای سیاسەتدا لە سەرخۆ دەڕوا و بە سەر خراپەکاردا باز نادات، لەبەر ئەوە کەس بۆی نییە خۆی بە خۆشباوەڕییەکی شێتانەوە ببەستێتەوە بەوەی کە سەرانی پارتی کوردستان ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕێبازی نەتەوەیی بێگەرد دەگرنە بەر چونکە ئەوە ئەگەر لە سەردەمی خۆی دواکەوت هەموو بەهایەکی سیاسی لە دەست دەدا و بەکەڵکی سەرەخۆشی و دڵنەواییش نایێ. ئەم سەرکردەیە، ئەگەر قیت بوەستێ و لووتی بەرز بکا و لە هەموو گفتار و کردارێکیدا شانازی نەتەوەیی لێ بتکێ، چاکە لەگەڵ خۆیدا دەکا بەر لەوەی لەگەڵ حیزب و میللەتیدا بیکا.

ئەم بابەتانەی قسەیان لە بارەوە دەکەین، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی ئۆرگانییان بە کوردە نیشتمانبەروەرەکانەوە هەیە، جا سەر بە حیزب بن یا نەبن چونکە بزووتنەوەی هەر میللەتێک لە ناو میللەتاندا نەریتێکی گشتییە و هەموو ڕۆڵەکانی دەگرێتەوە و کەرەسەیەکی تایبەت بە حیزبییەکان نییە. نووسینەکەی تۆ بە ئاشکرا و لە بەر چاوان بۆ چارەسەری ئەو بابەت و کێشانە خەم و هەوڵیانی زندوو کردەوە و دەروازەیەکی بەرینی بۆ قسەکردنێک خستە سەر پشت کە پێشتر لە سینگدا گێنگڵی دەدا و دەرفەتی نەبوو تیایدا بتەقێتەوە و مادام تۆ لەمەدا دەستپێشخەریت وەعدێکت بیر دێنمەوە نەریتی بۆماوە لە سەر چاکەکاران تۆماری کردووە ئەوەش ئەوەیە چاکەی چاکەکار دەبێ تەواو بکرێ. بە پێی نەریت و ئەدەب، لە ڕێی وابەستەیی یەکێ لە ڕۆڵەکانی عارەبەوە، بە ئاشکرا لە ڕێی ڕۆژنامەی «الحرية»وە وەک من قسەی لە سەر دەکا، قەومەکەت قەرزار دەبێ، کە هاتی لە ناو هەموو باسەکاندا «قەومیەت»ت هەڵبژاردووە و لە بەردەم هەموو قەومییە عارەبەکاندا کە ڕەزامەندییانە و پشتگیرییانە لێی بێدەنگ بوون و بێدەنگییان لە پێویستییانەوە بوو بۆیە بە زۆری خوێندرایەوە. من دەبینم ژمارەیەکی زۆر لە گەنجانی بەغدا بە سەریدا کەپرۆکە دەکەن و وەها پێیەوە سەرقاڵن کاروباری لاوەکی و مەترسییەکانی هاتوچۆییان بیر نامێنێ. بەو شێوەیە قەرز لە سەر وەکیل لادەچێ و دەکەوێتە سەر قەرزار خۆی و

هەر بە دانەوەی لە کوڵی دەبێتەوە و بە تەواوکردنی چاکە لە بری عارەب و دانەوەی قەرزەکەی سوپاسی ئێمەتان بۆ خۆتان و بۆ عارەب بەدەست هێنا. بە کورتییەکی لێی کەوتۆتەوە و لێی دانابڕێ، ئەوەش ئاڕاستەکردنی ئەو قسانەیە بۆ قەومەکەت، لە بارەی لەرزاندنی هەستی کوردەوە، ئەوەش وەک ئەرکێک لە کاری یەکەمتدا دەنگدانەوەیەک دەنگ دەداتەوە و دەنگدانەوەش بەڵگەیە بۆ نەمردنی دەنگ لە ناو دۆڵەکاندا.

تۆ قسەی خۆتت کرد و قسەکەت لە سەرەوەی گومانی تێکدانی نێوان پارتی کوردستانی و کۆمۆنستەکاندایە، کە هەندێ کەس لە نائاگاییەوە یا لە زۆرزانییەوە وای لێک دەدەنەوە و سووربوونت لە سەر مافی بێچەندوچوونی کورد زاراوەیەکی ڕاستگۆیە و پێویست بە وردبوونەوە لە ڕەوشتی بەرزتان نامێنێ، ئەگەرچی ئەوپەڕی ناسیاریم لەگەڵتدا ئەو قسانەتە کە جار لە دوای جار دەیانخوێنمەوە و کارەکەت بە هەر لادا وەرگەڕێندرێ و بە هەر پێوەرێک بپێورێ ڕەسەنایەتییەکی وای لێ دەردەکەوێ کە شایستەی دڵێکی گەورە و عەقڵێکی ڕۆشنە و بەم دانپێدانانەش بەو چاکەکاریەت دڵنەواییت ناکەم کە بە بێ پێویستبوون بە دانپێدانانی کەس بە دەستت هێناوە و بەڵگەش بەردەوامی نووسینی کوردە لە سەر نووسینەکەت جا باشیان نووسیبێ یا خراپ، بەڵام هەموویان ئەوپەڕێ ڕێزیان بۆ تۆ تێدایە. بەوە مافی خۆتت لە هەڵسەنگاندن وەرنەگرتووە بەڵام سوپاسی کەسی بێتوانای بێتاوانن کە بەگومانن لە هەموو شتێکدا غەدر هەبێ. ئەرێ بۆ نایەی دەنگ هەڵبڕی و ئازادی خوازانی عارەبیش بۆ چارەسەری کێشەی گەلی کورد، کە پەیوەندی پتەوی لەگەڵ گەلی عارەبدا هەیە لەگەڵتدا دەنگ هەڵبڕن؟ ئەی بۆ نابنە پێشڕەو لە ناساندنی کورد بە عارەب کە گەلێکە و بە تەنیشتیەوە دەژێ و لە هەندێ ناوچەی خۆیدا شەریکێتی، ڕۆژگاریش زوو یا درەنگ ئەو ناساندنە دەسەپێنێ؟ بۆ بەرژەوەندی گەلان وا باشترە بە وریایی و ئاگاییەوە چاوەڕوانی بەرەژانی ڕووداوەکانی پاشەڕۆژ بن. کورد ئەو سەردەمانەی تێپەڕاندووە کە قەبووڵ دەکرا میللەتان لە ناوبچن و ناویان لە تۆماری بووندا بکوژێتەوە و

ئێستا ڕاستییەکە لە لەناوچوون یاخی بووە و بە کاوەخۆ بە هەورازدا بەرەو لووتکە هەڵدەگەڕێ و لێیەوە دنیا دەبینێ وەک هەڵاتنی ئەستێرە دەبینێ کە بە حوکمی سروشت هەڵاتنی حەتمیە و ئەگەر چاوێک کوێرایی دانەهاتبێ و بەری دیدی بە تەواوەتی تەڵخ نەبووبێ، لەوەدا چ زەحمەتیی نابینێ کە هەوڵی کورد بۆ چارەنووسی خۆی لەگەڵ تێکۆشانی عارەبدا بۆ پتەوکردنی شانازی خۆی هاوتەریبە و وەک دژبەر یەکتر نابڕن ئەگەر دەستێکی پیلانگێڕی یا نەفامی ڕاستییەکەی خوار نەکا و ناشچمە سەر باسی گێڕانەوەی مێژوو. دەکرێ باسی هاوتەریبی ئەو دوو خەتە بە درێژایی سەدەکان و کاروباریان بکەم؟ لەو بارەیەوە گردەبڕ دەڵێم سێزدە سەدەیە ڕووداوەکانی مێژوو بە هاوبەندی نێوان ئەو دوو گەلە ڕیز دەبن و پەیوەندییان لە خۆشویستن بالاترە و هیچ گەردێک نییە لە سەر ڕوونیی پەیوەندی برا و ئازیزان نیشتبێ و ئەوەی لەگەڵ ئەم بۆچوونەشدا نییە با بەڵگە بهێنێتەوە و بەڵگەش بە هیچ جۆرێ لە ئارادا نییە.

ئەو مێژووەی لە هەناوی خۆیدا کۆرپەڵەی برایەتی ئەو دوو گەلەی هەڵگرتووە ئەمانەتەکەی گەیاندۆتە ئەم سەردەمەی ئێستامان و بە گوێچکەی عارەب و کورددا هاوار دەکا کە هەڵەی جیاوازی و دابڕان نەکەن و ئەوەی دوێنێ بە تێکەڵکردنی هەرِەمەکیی کوێرانە گەلانی تووشی مەترسی دەکرد، ئەمڕۆ خەریکی تەکنیک و دەرهێنانی یاسایە و چەندین قوتابخانە ڕێنمایی دەکەن و مژدەی دەدەنێ و وڵاتان وەک باسکی ئەختەبووت (هەشتباڵ) هاوکاری دەکەن و کەشتییە جەنگییەکان و هێزە ئاسمانی و زەمینییەکان لە پشتیانەوەن و کە جەنگاوەران دەپێکن چاکبوونەوەیان زەحمەتە.

مرۆڤی چاوساغ بۆ خۆلادان لە بەڵای ناگەهان سڵە و بە وردی یار و نەیار، هەروەها پلەی پشتیوانی و دوژمنایەتییان دیاری دەکا. هەڵەکردنێک لەمەدا ئەنجامی گەندەڵی بێ بە کورتهێنانی لێکدانەوە پاساو نادرێتەوە و نابێتە بیانوو:

سووکترین ئەنجامی گەندەڵی لە ئیجتیهاد جێگۆڕکێکردنی دۆست و دوژمنە یا گۆڕینی ناویانە، دۆست بە دوژمن و دوژمنیش بە دۆست.

ئەی خەڵکانی عارەب، ئێوەشم بێخەتا کرد لە چڕبوونەوەی ئەو نیەتەی کورد، کە لە ڕابردوو و ئێستایانەوە، لە ئاوات و بەرژەوەندییانەوە و لە هەموو شتێک و چاوگێکەوە کە نیەت و نیازی لێ دروست دەبن و بە چڕیی لێیان ورد بوونەتەوە، بە نیازی چاکەی ئێوە و دڵڕاگرتنتانن تا بەرژەوەندی هاوبەش و چارەنووسی هاوبەش و هەستی هاوبەش و مەترسی هاوبەش بخوازن.

وڵاتی کورد لە ڕۆژهەڵات و باکوورەوە وەک کەوانە وڵاتی ئێوەی لە ئامێز گرتووە و سنگ و ژێی بە هیممەت و ئامادەیی خەڵکەکەی بۆ داکۆکیکردن لە لانەی ئێوە و خۆیان کش دراوە و هەر کاتێ ویستتان دەستدرێژیکەری ستەمکاران لەوێوە تیرباران بکەن.

ڕەنگە هەبێ بڵێ عارەب بە فرەوانی وڵاتیەوە و بە زۆری ژمارەی و بە زۆری داهاتیەوە و بە ئێستا و ڕابردووی دەوڵەمەندیەوە چی لەم بەزمە داوە، منیش دەڵێم ئەوە بۆچوونێکە لۆژیکی ئازادیخوازان و مافی هاوسێیەتی و دووربینی لە کاروباردا تێدا نییە و قەت برا گەورەیەک نەبووە پێویستی بە برابچووک نەبووبێ هانی بدا و پشتی بگرێ و کاروباری لێ سووک بکا.

هەموو ئەوانە بە عارەب وەک نەسیحەت بڵێ نەک خەڵەتاندن و وەک قەرزدانەوە و ئەنجامدانی ئەرک ڕێگای هاوسۆزی گەورەتر و هاوکاری بەهێزتر لە نێوان ئەو دوو گەلەدا خۆش بکە، هەروەها لە پێناوی بەرژەوەندی و ئاشتیدا. من هەڵوێستی ئێستای ئازادیخوازانی عارەب و کورد، هەڵوێستی ڕۆشنبیرە پێشکەوتووەکانیان دەبینم بە پێی پێویست هەقخوازانە نییە و توینێتی کەسی تێنوو ناشکێنێ و دڵەڕاوکێ وەلانانێ. ماوەیەکە لێرە و لەوێ ئەوانەی دڵیان بۆ بەرژەوەندی هەردوو ئەو گەلە دەسووتێ، ئاماژە دەدەن: لە هەندێ قەڵەم و زمانی عارەبییەوە، ئەگەرچی بە نیەتی باشیشەوە بێ، باسی ئەوە چەندبارە دەبێتەوە کە پێویست بە باسی برایەتی عارەب و کورد ناکا

چونکە ئەو برایەتییە بەڵگەنەویستە و ئەوە ناهێنێ بەردەوام بگوترێتەوە. ئەوەش دوورکەوتنەوەیەکی زۆرە لە پێداویستییەکانی بارودۆخ، چونکە ئەو برایەتییە دەرفەتی نەبووە بەرهەمی چاوەڕوانکراوی هەبێ لە ڕوویەکەوە کە مافی کورد – وەک برای عارەب - تیایدا جێگیر بووبێ و بە یاسا شوورەبەند کرابێ و وەک بەرهەمێک لە ژیانی سیاسی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ئابووری و هەموو ئەو بوارانەدا ڕەنگی دابێتەوە کە پەیوەندی بە مافی گەلێکی ناو گەلانەوە هەبێ. دروشمیش کە بە عادەت بۆ جێبەجێکردن بەرز دەکرێتەوە دەنا قەومییە عارەبەکان بۆچی بە سووربوونەوە لە هەموو بۆنەیەکدا باسی یەکگرتنەوەی نیشتمانەکانیان و وەدەرنانی زایۆنی و ئیستیعمار دەکەن لە کاتێکدا ئەو مافانە لە زەیندا لە برایەتی عارەب و کورد ڕوونترن و بەو پێیەش پێویست بە گوتنەوەیان نامێنێ؟ بەرزکردنەوەی دروشم دوای جێبەجێکردنی، نەک پێشتر، دەبێتە جۆرێ لە شێتی و چەنەبازی. ئا ئەوە خلیسکێکە و سەرنجی خێرا لێی دەخلیسکێ و ئەوەش خلیسکێکە بە زەوقی کورد هرس ناکرێ و بە ساردی و ئاسوودەیی لە سەر دڵی دڵڕەشان و بێخەمانەوە دەنیشێ و ڕێ لە گاڵتەجاڕانیش دەگیرێ تا نەبنە بەربەست لە بەردەم عارەبە قەومییەکاندا بۆ گوتنەوەی دروشمی برایەتی عارەب و کورد بە ئەندازەیەک دەمی ئەو ناحەزانە دابخا کە بۆ ئەو دوو گەلە لە کەمیندان و بە فیڵێ سینگ دەردەپەڕێنن لێی شارەزان و هونەر و جادوو و دەجەل بۆ نەخشاندنی بەکار دێنن.

هەندێ جار قسەیەک بەر گوێ و چاوی مرۆ دەکەوێ گوایە کورد کەمینەیەکی زۆرە یا گەورەترین کەمینەی عیراقە و لەم بارەیەوە دەڵێم دڵگەورەترین خەڵک لە لێکدانەوەی چاکدا ناتوانێ بە شێوەیەک کەمایەتی لێکداتەوە کە دەرگا بێ بۆ زۆرایەتی فرەوانی هیچ شتێک و کەمایەتیش بۆ قەومە ناکوردەکان، جگە لە عارەب، بە ڕاست دەگەڕێ چونکە کورد ڕەگەزێکی بێگەرد و ڕەسەنە و لە ناوچە و گوندی خۆیدا دەژێ و وەک جێگیربوون بە خاکەکەیەوە وابەستەیە و ڕەگ و ڕیشە پێوەی دەبەستێ و

شتێکی پەرشوبەڵاو نییە لێرە و لەوێ پەرت بووبێ و وەک کرێچی بچێتە شوێنان و بۆ کەسابەت ئەم ناوچە و ئەو ناوچە بگەڕێ، چونکە کورد لە خاکی کوردستان و ئاو و ئاسمانیەوە کەلەپووری ڕەگداکوتاوی خۆی لە کۆنی کۆنەوە بۆ ماوەتەوە و بۆنوبەرامە و شیعری بیرەوەری باوباپیرانی بە ئەمڕۆوە گرێی دەدا و بە پاشەڕۆژدا ئیلهامی نەمری دەگەیەنێتە نەوەکانی و نەوەی نەوەکانی. بەرزترین خەسڵەتی کورد بە پێی ئەو ڕۆڵە نییە کە لە پێکهێنانی عیراقی سیاسی و جوگرافیدا دەیگێڕێ و ژمارەی کورد لە نیوەی عیراق کەمترە و ڕووبەری خاکەکەشی لە نیوەی خاکی عیراق کەمترە و هیچ ژمارەیەک نییە لە نیوەی ژمارەیەکی تر، کە لە ناو ژمارەکاندا هەڵیبژێرین، کەمتر نەبێ. پەنجا لە نیوەی دووسەد کەمترە و سەد ملیۆنیش لە نیوەی سێسەد ملیۆن کەمترە. کەمبوونی شتێک لە نیوەی ئەو شتەی بەشێکیەتی، کەمایەتییەکی جەوهەری نییە تا بکرێ بە کەمایەتی خەسڵەتەکانی بەڵکو مەسەلەیەکی لاوەکییە و حوکمی پێ نادرێ و بە بەڵگە دانانرێ چونکە کورد یەکێکە لە دوو گەلی سەرەکی و عیراق پێکدەهێنن و جگە لەم پێناسەیە هیچ پێناسەیەکی تری بە سەردا ناسەپێ کە بەڵگەی بەهێزی بوونی بێ. بۆ ئەوەش پەنا نابەینە بەر سۆز و دڵڕاگرتن بەڵکو ئەوە حوکمی لۆژیک و واقیعە کە مەسەلەکە یەکلایی دەکاتەوە. ئێوەی ئازادیخوازانی عارەب ئەگەر قسەی ئاوها بکەن، بە گوێ خۆشترە و گومان دەڕەوێنێتەوە و بەڵگەی فیتنەیی و پیلان و گەندەڵی ڕەت دەکاتەوە.

لە پرۆگرامی حیزبەکانیشدا باسی کورد و مافەکانی نییە و هەر دەڵێی بۆتە چاولێکەرییەکی جوانی حیزبە نیشتمانییەکانی سەردەمی لەناوچوو. باشترین نموونەش ناوەڕۆکی پرۆگرامی پارتی کۆنگرەیە کە ساڵی 1956 نیشتیمانی دیموکراتی و پارتی سەربەخۆیی تێکەڵی بوون، کە دوای گۆڕینی یەک وشە بەندی تایبەت بەو بابەتە بۆ دەستووری کاتی گوازرایەوە و بوو بە ماددەی سێیەم، لەم بارەیەوە مامۆستا کامیل چادرچی و سدیق شەنشەل و سیماکانی تری پارتی کۆنگرە بە دوور و درێژی لێی دەزانن. بەڵگەیەکی دەستخەتی

چادرچیم لە سەر ئەم بابەتە لە لایە بۆ کێشەی بیرچوونەوە بەسوودە. لێرەدا بۆ ڕەواندنەوەی گومان دەڵێم بوونی ماددەی سێیەمی دەستووری کاتی جێی ئەوە ناگرێتەوە دەق لە مەنهەجی حیزبەکاندا لە بارەی کورد و مافەکانیەوە هەبێ و باس بکرێ، چونکە هەبوونی باسی عارەب لە دەستووری کاتیدا بەربەستی باسکردنی عارەب نییە کە باسی کاروباری عارەب تیایدا سەر دەکا. هەرچی عارەب دەگرێتەوە، کوردیش دەگرێتەوە و هەردووکیان هەستیان هەیە و برا بچووکیش زیاتر دڵڕاگرتنی پێویستە.

وشەی «شعوبی»ش کە لە کاتی هێرشبردن بۆ سەر نەیاری عارەبدا یا لە کاتی بەرپەرچدانەوەدا باس دەکرێ، بەر گوێ دەکەوێ و ناوەڕۆک لە دەست دەدا. ئەو وشەیە لاستیکییە و ئەگەر وریا نەبین پتر لە واتایەک دەگەیەنێ و لە کوێ گومانی لێکدانەوەی خراپ کرا، زیاتر لەوێ پێویست بە سڵکردنەوە دەکا و ئەوەش لە مرۆڤی ژیر شاراوە نییە.

لە لایەن نووسەرانی عارەبەوە باسی کاروباری کورد بە شێوەیەکی گشتی، لە ناوخۆی عیراق و لە دەرەوەیدا، هەنگاوی بەرینی بۆ نەندراوە کەچی بە پێچەوانەوە دەبینم، نووسەری کورد لە دیدی کاروباری عارەبەوە و بە پێی گونجانی نێوانیان باسی قەومەکەی خۆی دەکا. چەندین ڕستەی پێشەکی لە سەر کاروباری تایبەت بە کورد نووسراون کە بە بێ ئەوەی خوێنەر چاوەڕوان بکا ئەنجامیان بەرەو لای مەسەلەی عارەب براوە، بۆ نموونە دەڵێ «کورد کۆمۆنست نین کەوابێ.... ئیتر خوێنەر چاوەڕوانی ئەنجامگیری ئەو پێشەکییە دەکا کە بە بەرژەوەندی کورد و بە چاکەی بشکێتەوە، بەڵام کۆتایی ڕستەکە بەم شێوەیە دەبینێ.. نابنە کێشە لە بەردەم یەکگرتنی عارەب» ئەمەش ئەوپەڕی توانەوەیە لە ناوتاندا و پێداهەڵدانی ئێوەیە یا وەک سەرسامبوونی برابچووکە بە براگەورە و کاری بۆ دەکا و بە کارەکەیدا دەچێتەوە و ناگاتە ئەوسەری سەرسامبوون پێی. ئێوەش هاوڕامن کە ئەم گەلە شایستەیی ئەوەیە بە شانیدا بدرێ و دەست بە پشتیدا بدرێ و دەست بە سەریدا بهێندرێ و داوای لێبوردنی لێ بکرێ... گوێچکەکان چاوەڕوانی دەنگی نارەزایی عارەبین

لەو غەدرانەی لە دەرەوەی عیراق لە کورد دەکرێن، ئازار دەدرێن و دەکوژرێن و ئاوارە دەکرێن. کورد گوێقولاغە بۆ وشەی عارەبی لە بواری نێونەتەوەییدا بەرگری لێ بکا!! یا لە باسی ناوخۆی عیراق لانەدەین! ئێمە لەم بوارەدا، بۆ بەرگریکردن لە بەرژەوەندی و مەسەلە هەمەشێوەکانی کورد، کە مەسەلەی جەوهەرین و بە سۆزەوە چاومان تێبڕیون و بێمافی و پشتگوێخستن لە دەروونماندا بەهێزیان کردوون، لە هیممەتی عارەبیمان کەمە. ڕاتان لە کەمیی پرۆژە ئابوورییەکان، لە ناوچە کوردییەکاندا چییە؟ ڕاتان چییە بە هۆی دروستکردنی بەربەستی ئاوەوە لە سەردەمی لەناوچووودا، زەویوزار ژێر ئاو کەوتبێ و خەڵکەکە بە هەڕەمەکی کۆکرابێتنەوە و کارەساتی وایان بۆ دروست بووبێ ڕۆتین و نارەزایی و پێشدەستگرتن چارەسەریان نەکەن؟ قسەی خۆتان لە بارەی بەڕێوەبەرایەتی خوێندنی کوردییەوە بکەن کە هیوای پێوە بەسترابوو تا کێشەکانی ڕۆشنبیری کوردی چارەسەر بکا و بەربەستە کەڵەکەبووەکان وەلانێ و خۆتان دەزانن سەرووەری هیچ قەومێک بەدی نایێ ئەگەر بە مەمکی دایکی خۆی گۆش نەکرێ! لەم بوارانە و بواری تردا هانی خێراکردنی هەنگاوەکانی حکوومەت بدەن کە بە عادەت ژیانی میللەتان پێیان ڕازاوەن و ڕەنگە وشەیەکی ئێوە لە دەیان ئەرزەحاڵ و سەردان و گوتاری ئێمە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی حکوومەت بۆ هەندێ مەسەلە کاریگەرتر بێ. ناوی شەهیدەکانمان لە ڕۆژی کوشتنیاندا بێنن چونکە ڕۆحمان پێویستی بە دڵنەوایی هەیە و چۆن دیارییەکی جوان فرمێسکی یەتیمێک دەسڕێ، ئاوهاش دڵنەوایی برینی ئێمە تیمار دەکا. بۆنە و جەژن و سەرووەریمان بەرز ڕاگرن چونکە ئێمەش مرۆڤین و وا پەروەردە بووین هەرچی کەرامەتمان پێی ڕازی بێ لە زارمان شیرینە و چاوەڕوانی چاکەین بەرانبەر چاکە. «ئەگەر سڵاوتان لێ کرا وەڵامی گەرمتر بدەنەوە یا هەر وەک خۆی».

ئەمانەتی هەرە گەورەمان کە لای ئێوە بێ و پارێزگاری لێ بکەن، ماددە سێیەمی دەستووری کاتییە کە لە ڕۆژی لە دایکبوونیدا هەموو کوردێک هەستی کەرامەتی کرِدراوەتەوە و سەرلەنوێ خولقاوەتەوە. وەک سەرمایەی

بەخیلێک لێی دەڕوانین کە تەمەنی خۆی لە سەر دانابێ و فلس فلس کۆی کردبێتەوە تا بە دەستی هێناوە. وەک چۆن دایکێک کە منداڵی بۆ نامێنێ، بۆ پارێزگاری لە منداڵێکی تاقانەی لە ئینس و جن دەپارێتەوە، ئاوها لێتان دەپاڕێینەوە لە چاوی پیس و زمانی بەد پارێزگاری لێ بکەن و خەریکە پەنا بۆ جادوو و تەلەسم و گۆڕی چاکان ببەین و بەردی قەبری لێ بسوین. ئەی عارەبە ئازادیخوازەکان لە بەردەم دادگای مێژوودا هانا بۆ ویژدانتان دەبەین بۆ پاراستنی ئەو ماددەیە لە پیلانی خەڵکانێک کە بۆتە دەرد لە زاریاندا و ڕم لە چاویاندا، هەوڵی خۆتان بخەنە پاڵ هەوڵی ئێمە و تای تەرازووی داوامان، ئەگەر بە تەرازووی هاوسەنگ بپێورێ، بە لای هەقدا دەشکێتەوە.

لە هەموو ئەوانەشدا دەرۆزەی چاکە ناکەین بەڵکو داواکاری مافین و سڵاو لە بەویژدانانی هەردوو دنیا.

نووسینی هۆشیار (مەسعوود محەمەد)

*ئەم گوتارەمان لە مامۆستا "هۆشیار"ەوە پێگەیشتووە و تیایدا بەرپەرچی ئەو هەرایە دەداتەوە کە لە ڕۆژنامە و دائیرە حیزبییەکاندا، لە سەر گوتارێکی پێشتری کە لە 1960/07/10 لە «الحرية»دا بڵاو کرایەوە، بەرپا کراوە و هەندێ خاڵ ڕوون دەکاتەوە.*

**وشەیەک کە دەبێ بگوترێ**

هەندێ کەس وەک تێکچووبن دەپرسن بۆچی لە «الحرية»دا بڵاوت کردۆتەوە؟ ئەو ڕۆژنامەیە ناحەزی توندوتیژ و ئاڕاستەی جێگیر و مەحکەمی هەیە و لاپەڕەکانی لەگەڵ ئەو توندوتیژییەدا ڕیزبەند بوونە و کەلێنێکی نییە نووسەر باوەڕی خۆی لە ئاستی ڕەهایی و سەربەخۆییدا پێیدا تێپەڕێنێ.

منیش دەڵێم ئەوە لێکدانەوەیەکی خراپە و سەرچاوەکەی بۆ بەدحاڵیبوون یا بۆ نیەتی بەد دەچێتەوە و هیچ بەڵگەیەک بۆ بێلایەنیم لەوە گردەبڕتر نییە کە ئەگەر بمەوێ بچمە بینای «الحرية» ڕێ دەرناکەم و ئەگەر پێشم بڵێن ئەو پیاوە خاوەنی «الحرية»یە، نە بە بەڵێ وەڵامم هەیە نە بە نەخێر، چونکە هەتا ئەم ساتە نازانم شوێنی «الحرية» لە کوێی پایتەختە و نازانم لە ناو هەموو پیاواندا کامە پیاو خاوەنێتی.

ڕەنگە هەبێ بڵێ هەق نییە وا دابنێی ئێمە پێشەکی ئەوەمان زانیبێ و منیش دەڵێم ئێستا زانیتان و لە پشت تیشکۆی گەورەکردنەوە سەرنجی وردی وەها بخەنە سەر حەرف و وشە و تەعبیری گوتارەکە، کول نەبووبێ ئەوجا شەرمەزار دەبن کە ئەو هەموو بێلایەنییە ئاشکرایەتان نەدیوە کە تەنانەت لە

تێگەیشتنێکی نەخۆشیش شاراوە نییە و جێی سەرسوڕمانیشە کە «الحریة» لەگەڵ ئەوەشدا گوتارەکە ڕوون و ڕووتە، قەبووڵی کرد بڵاوی بکاتەوە. کێشەی من ئێستا ئەوەیە چۆن داوا لە خاوەنی «الحریة» بکەم دڵی فرەوان بێ و ئەم بابەتە بڵاو بکاتەوە کە هێشتا بۆ بڵاوکردنەوەی بابەتەکەی پێشتر ئەرکی سوپاسکردنیم بە ئەستۆوەیە و دەترسم ئەم داوایەم زیادەڕۆیی بێ بە سەر چاکەکارانەوە. بەڵام ئەگەر قەبووڵ بکا یا نەیکا، من سوپاسی دەکەم. دوای ئەوە، ئەی لە کوێ بڵاوی بکەمەوە؟

ئەوە «خەبات»ی ئازیزی کورد، ویڕای دەستدرێژی پاش گوتاری یەکەمم، دووکەڵێکی نەیارانەی وەها لە سینگی هەندێ لە نووسەرانیەوە هەڵدەستێ، مەگەر لە گڕکانێکەوە بێ کۆنەقین و گڕاوی گڕکانی دێرین سەرچاوەی بن، وەها تەقیوەتەوە خڵتوخاشی بە جۆرێ پەرت بووە سنووری گوتارەکەی بەزاندووە و تەپوتۆزی گومانێکی چڕی بە ڕووی هەڵهاتنێکی پایەداری داری زانایی بەرز کردۆتەوە کە لە گوتارەکەی دکتۆر عەبدولڕەزاق محێدیندا بەرز بووەوە و لقی بەرەو ئاسمانی ڕۆحە خێرخوازەکان و عەقڵە ڕۆشنەکان هەڵزناوە و بە بەرە بەپیتەکەی هەموو تۆمەتکارێکی کە بەر دەڕنێ دەپووکێنێتەوە و بە خۆی و بە لقەوە بۆ ڕەسەنایەتی عیراق دەگەڕێتەوە و لە پروشکی چەرخی ڕۆژهەڵاتی یا ڕۆژاوایی دەیپارێزێ و چراکەی لە ناو شووشەی زاناییدا داگیرساوە و بەر لەوەی بگاتە زەیتی مەشخەڵی ئازادی، دایدەگیرسێنێ و زەیتیش تواوەی دڵ و ئاوی ویژدانە. ئاگر و پروشک لەو ڕووناکییە دەبنەوە و دەرگای «خەبات»یش بە ڕوومدا داخراوە و ئەگەر لێیدەم کەس نایبیستێ و بشکرێتەوە گڕاوی گڕکانە.

ڕۆژنامەی هەر حیزبێک بگری ڕازی نابێ ببێتە پێشانگای بیری حیزبێکی تر مەگەر هاوپەیمانی یا ناتەبایی لە نێوانیاندا هەبێ و من بۆ ئەو تەباییە سوپاسگوزارم کە لە نێوان «خەبات» و ڕۆژنامە حیزبیەکانی تردا هەیە و ئەگەر یەکێکیان بەرانبەر «خەبات» گەردێ لە دڵیدا بوایە ڕێی نەدەدا ڕقەکەی بقۆزمەوە و ئاگری ڕەخنە بە ڕوویدا بپرژێنم.

ڕۆژنامەیەکی خۆمیشم نییە ئاوات و داوامی تێدا بڵاو بکەمەوە و خەریکە چاوم خێل دەبن لە چاوەڕوانی قەراری وەزیری ئیرشاددا کە من و چەند هاوڕێیەک بەر لە بڵاوبوونەوەی گوتارەکەم داوامان کرد ئیجازەی ڕۆژنامەیەکی کوردی و عارەبی وەربگرین و ڕەنگە جەنابیان کە دەبینێ فرسەتی دەربڕین لە نێوان چەکدار و بێچەکدا چەند جیاوازە، دڵی نەرم بێ.

ڕۆژنامەکانی تریش، ئەگەر بە وردی بیانژمێری، دەبینی هیچیان هی ئەوە نین گوتاری وایان تێدا بڵاو بکرێتەوە، مەگەر لەوانە بن کە بە ئاشکرا باسی قەومییەت دەکەن بە تایبەتی ڕۆژنامەی «الحرية» کە نەمامگەیەکە و لێهاتوویی دکتۆر عەبدولڕەزاق شینیداوە و خۆزگە هەموو نەمامەکانی تریشی بگرتباوە.

ئەگەر ئەو دڵکرمێییە نەبوایە کە گومان دەبارێنێتە خەیاڵی بێئاگایانەوە و هەواڵ دەگەیەنێتە دەسەڵاتداران ئەو شانازییەش بۆ «الحرية» بەسە گوڵەگەنمی فکری کوردی خستۆتە سەر زەخیرەی عارەب و باوەشی خۆشەویستییان بە یەکدا کردووە وەک دەستەیەکی یەکگرتوو کە برایەتی بەهێز یەکیان دەخا، یەکیان گرتووە.

ئەو برایەتییەی کە نووسەران لە لاپەڕەکانی «الحرية»دا بە دەنگیەوە دێن و لە پێناویدا هاوکاری دەکەن برایەتییەکی خۆڕسکە و باشترین خەسڵەتەکانی مرۆڤ، کە سۆز و خۆشەویستین دەستیان بە سەردا گرتووە و برایەتییەک نییە بەرنامەی بۆ داڕێژرابێ یا «سەرەوخوار» کرابێ تا بە پێی بەرژەوەندی پێویستی بە لێکدانەوە و شیکردنەوە هەبێ و هەندێ جاریش بگۆڕێ و ببێ بە دەمی تیغ و پەت، تا لە مل گیر ببێ و قەت لە ناو هەوڵی قەڵەمەکان و زمانەکاندا هەوڵێ نابینم لەو هەوڵە شەریفتر و باڵاتر بێ کە ژێی نزیکایەتی نێوان ئەو دوو قەومە بە خاوێنی و دوور لە بەرنامەی داڕێژراو و قاڵبەندی بگەیەنێ تا زرینگەی ئاوازەکانی بێغەلوغەش وەک ئاوی ژیان بکشێ تا ئەوەی

ئەگەر دڵی کوردێ یا عارەبێ بۆ ئەوین لێیدا ژێیەکان شەپۆل بە خوێنی کورد و عارەب بدەن و هەموویان بۆ پیرۆزی برایەتی بکەونە سەماکردن.

ناکرێ جگە لەم شێوە برایەتییە ڕوون و ساکارە لە برایەتی بگەین، ئەو تەسلیمبوونەش ڕەت دەکەینەوە گوایە کۆمەڵگەکەمان تا ئەو ئاستە گۆڕاوە دەبێ لە بۆچوونمانیشدا بگۆڕێین و بەوەش تەسلیم نابین گوایە پێشکەوتن بۆچوونی پێشکەوتنی بەرەودوا دەوێ و هەوڵی «لەقاڵبدان» و «بەرنامەدانان»مان دیت و تیایدا ژیاین و تێگەیشتین برایەتی گەلان لە هەموو بۆچوونە سیاسی و فەلسەفییەکاندا یا لە هەموو بۆچوونە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکاندا کە بە خەیاڵدا دێ، چی دەگەیەنێ بەڵام قسان لەو بوارەدا تا ئێرە کە هێنامان کورت دەکەینەوە. برایەتی گەلان بە پێی بۆچوونی کۆمۆنستان ئەنجامی جەنگی چینایەتی و کۆمەڵایەتییە لە بوارە جیاوازەکانی ئەم گەل یا ئەو گەلدا و ئەنجامیش وا دەشکێتەوە کە حیزبی شیوعی هەردوو گەلەکە سەردەکەون، ئەوجا دەست دەخەنە ناو دەستی یەکتر و لە جیهانی ئیشتراکیدا یەک دەگرن و لە بەهەشتی ئەبەدیدا دەژین. ئەو برایەتییەی شیوعییەت باسی دەکا جگە لەم برایەتییەی تێدا نییە و ناشبێ هەبێ. مەزهەبێک جێی برایەتی تاکەکانی کۆمەڵگەیەکی یەک گەل و یەک شار و یەک گەڕەک و نێوان دوو برای یەک خێزانی تێدا نەبێتەوە و بە مۆرفینێکی بزانێ کە پرۆلیتار پێی خەوتووە و بەفیڕۆدانی مافەکانە، بەڵگەنەویستە جێی برایەتی «بەرین»ی نێوان گەلانیشی لێ نابێتەوە. ئەگەر کێشە و زریانی سروشتی و مەزەبی و ڕەگەزی یەخەی بەردەن و ژیانی بەرەو ئارامی و داهێنان و هەبوونی بڕوا و ئارامی و ئاسایش سیمای بگرنەوە و برایەتی لە ئاستی ناوچەیی بسەپێنن، دراوسێش ئارام و سوودمەند دەبێ. لێرەوە فرسەت لە بەردەم ئەوانەدا نابێ کە بینای خۆیان لە سەر کێشە و ململانێ و هەڵچوون و داچوون دادەمەزرێنن کە بە هیچ ئەنجامێک ناگا مەگەر ئەو بینایە هێز و دەسەڵات بەدەست بێنێ.

ئێمەی ڕۆڵەکانی گەلی کورد تاقیکردنەوەی زۆرمان لەگەڵ ئەو برایەتییەدا هەیە کە شیوعییەکان پەیڕەوی دەکەن، هەروەها بۆچوونی تریشیان. هیچی ترمان پێویست نییە بیخەینە سەری.

لێشاوی خەڵکی شۆڕشگێڕمان دیت لە شەبەقەوە تا دوای خۆرئاوا حەسانەوە و پشوویان لە خەڵکی هەڵدەگرت و جەماوەرمان دیت لە ڕێپێواندا خەنجەر و چاوی هەڕەشەیان دەچروسکانەوە و لالغاوی خیتابخوێن کەفی دەردەدا و مەترسی گەورەمان لە سەر ژیان و ئازادی و کەرامەتی ئەو خەڵکە دیت، کە هەندێکیان لە ترساندا سەری خۆیان بۆ چیا هەڵگرت و هەندێک ترسیان گەیشتە ئاستێک نە سنوور پێشی گرتن نە بەندوباو و خاکی نیشتمانەکەیان هەڵیهێنانەوە و نەفرتیش لە دوایانەوە بوو و هەندێکیش لە ماڵی خۆیاندا گۆشەگیر بوون و چاوەڕوانی بەشی خۆیان بوون لە سووکایەتی و خەبەرلێدان و هەرچی بەڵا و کێشەیەکی کە بە دوایاندا دێ. خەڵکانێکیش لە ناخی ویژدانەوە بە دیتنی ئەوەی دەیاندی هاواری نارەزاییان دەکرد و ڕازی نەدەبوون بە ناوی پێشکەوتنخوازی و گەشەسەندنەوە هاوتەریبی تاوانکاری بن و بەڵای وەک بەندکردن و دوورخستنەوە و هەڕەشەی بەندکردنیان تووش بوو و لە سەر حیسابی ئازادی کەرامەتی خۆیان قووتیان دایەوە و زریکەی منداڵ و گریانی ژن ئێش و ئازاریان دەگەیاندە ناخی دڵ و بەڵێن، ئیشتیای گورگی برسێتی هەناو و کەللەسەری بەتاڵی هار دەکرد و خەونی کۆشک و کچانی لێوبەخەندە دەهاتە بەر وەهمی مەحروومبوویان و لە ژێر تەوژمی ئارەزووی گڕگرتوودا بە لادا دەهاتن و لەگەڵ ئاوازی تەپڵی هار و زوڕنای چەنەبازدا وەک مەست چەپڵەیان دەکوتا و سەمایان دەکرد و ئێزگەی ڕادیۆش بە قسەی هاندەرانە بۆ دەستوەشاندن ئاگری ئەو پیسییە هارەی گەشتر دەکرد و تەنانەت پیرەژنیش کە کفنی تەمەن لە پرچی سپییاندا دەدرەوشایەوە و منداڵی خونچە «درک»یش وەک دووپشکە چزووی خۆیان بەرز دەکردەوە و ڕێپێوانی خۆیان ڕێکدەخست و بەیانیان و ئێواران وەک گەردەلوولی بچکۆلە بە کۆڵانەکاندا دەخولانەوە و زمانە بێتاوانە

پیسکراوەکانیان لە شەرەفی پشت پەچەی خەڵکی دەردەهێنا تا گڕکانی بێئەدەبی بە سەردا داباریێنن... بازووی کرێکاریش لە جێیەکدا چەکوشی دروست دەکرد کە پۆڵای لێ نییە تا بکوترێ یا ئاسنێک تا بازوو هەڵیسوڕێنێ و هەڕەشەی هاڕینی ئەو باسکانە بە ئێسکەوە بکا، کە وچان دەدەن. کۆمەڵێ داسی تیژکراویش بە هەڕەشەی پەڕاندنی سەر و باسک بۆ سەر خەرمانی بەرهەمی گشتی، بە بێ جیاوازی نێوان خراپەکار و بێتاوان دەترووسکانەوە و هەڵاوی دۆزەخیش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەتینتر دەبوو و زیاتر فووی لێ دەکرا و سووتەنیی دەخرایە سەر تا ڕۆحی خەڵکی دەرەوەی کۆڕی زیکری گەرمی چینایەتی گەیشتە لووت و وایان لێ هات لاق لە لاق گیر دەبوو و کەس نەیدەزانی بە کوێدا بڕوا و مەنزڵگا کوێیە و چاوان ورد دەبوونەوە و سەرسامبوونی مەزن لە ناخی دڵەوە سەریان دەکرد و بە سەر سیماوە دەنیشتنەوە و نەماندەزانی ئاخۆ بەڵا تووشی دانیشتوانی زەوی دەبێ یا خوا هیدایەت دەدا. قەومێک کارەسات بە سەر ڕۆژگاریاندا داباریوە و کردوویەتی بە شەو و شەویشیان بە شەوەزەنگ و لە سروشتی خۆی هەڵگەڕایەوە و وەک چاوێکی لێ هات لە داخاندا سپی هەڵگەڕابێ و نە سەیر بکا و نە ببینێ. بەرەو وێرانکاری و کاولکاری دەچووین. بەڵام دەستێک کە توانای جڵەوکردنی هەبوو و جڵەوی کرد ئەوجا لغاو دەمی قووتدانی پێ داپچڕی و لە هەموو لاوە قامچی جادوویی بۆ سەر پشتی داباری تا گۆڕا و بووە دووکەڵ و چاوەڕوان بوو بچێتەوە ناو قومقومی سەرمۆری خۆی. هەر بەتوانایەک هەوڵ بدا داهێنان لە باسکردندا بکات چەند هەوڵ بدا ناتوانێ وەک خۆی باسی بکا و دڵخۆشییەکی کە دەیمێنێ ئەوەیە کە قەڵەم و زمان چەند لە ڕوونکردنەوەدا ماندووش بن هێشتا تەزوو لە پێستدایە و دەنگدانەوە لە گوێدایە و تۆزانەوە لە خوێندایە و دێوەزمەی سوور لە خەیاڵدایە و لاناکەوێ.

لەوە حاڵی بووین پێکەوەژیانی ئاشتیانەی گەلان و باوەڕەکان لە مەزەبی کۆمۆنیزمدا چۆنە تا ئەوەی بە زەبری تفەنگ و ڕەشاش چەقۆیەکی پیازپاکردن لە ناکۆمۆنست بە زیاد بزانن، ئەوجا دواکەوتنی دروشمە

هاوردەکەیان، کە هەر دوو کەس لە بن میچی ژوورێکی ماڵێکدا کۆوەبن جێی گومانی پیلانگێڕییە و هەر دەڵێی پیلانگێڕان گەمەی شەترەنج یا گەمەی تاوڵەیە و بۆ ئەنجامدانی پێکەوەبوونی دوو کەس بەسە لەو بارودۆخە خنکێنەرەدا کراسی ئەرخەوانییان لەبەر بێ. ئەوانەی بەدواداچوونیان بۆ ڕووداوەکانی مێژووی سەردەم هەیە چاودێری جۆری ئەو پێکەوەژیانە برایەتییە دەکەن کە لە نێوان مارکسییەتی حیزبی شیوعی و مارکسییەتی حیزبی کوردستانی (پارتی)دا هەیە. زنجیرەیەک توندوتیژی لە نێوان ئەو دوو حیزبەدا ڕووی دا دوایی کەوتنە گفتوگۆوە و پارتی بە هۆی بوونی ڕەوتێکی مارکسی ناو سەرکردایەتی خۆیەوە، کە چوار مارکسستی تۆخ پێشڕەوایەتییان دەکرد، بە دۆڕاوی لێی دەرهات و هەموو ڕێخراوە خوێندکاری و پیشەیی و ئافرەتان زەرەرمەند بوون و شیکەرەوەی سەیر بوون بۆ تێکەڵبوون و هاوسەرگیری نێوان ڕێکخراوەکانی هەردوو حیزب و هەندێ جار بە تەماحوەبەرنانی خوازبێنیکراو و هەندێ جار بە هەڕەشە و ترساندن. ئەوجا بابەتیان بە فیشکە نێونەتەوەیی و زرینگەی دیموکراتییەوە هێنا کۆتر لە پەنایدا لە شەقەی باڵی دەدا و کاتێکیش بووکی مارەکراوی کوردستانییان بۆ زاوای سوور گواستەوە کەوتنە هەلهەلەلێدانی گەلان، بەڵام بووکێ ڕازی نەبوو کەرامەتی بشکێ و لێوی تەڕی بمژرێ و تفی ڕۆ کردە ڕوخساری قۆڵبڕەکە و بە ڕابردووی پاک و سەری بەرزەوە هانای بۆ کوردستانی دایکی بردەوە و پێیان گوت ئەگەر بە هاوسەرگیری و تێکەڵبوون ڕازی نەبی یاسا دان بە بوونتدا نانێ، ئەویش گوتی من ڕەسەنایەتی خۆمم پێ چاکترە لە دووڕەگی و دەمرم بەڵام بە سەرشۆڕی ڕازی نابم. دەشڵێن ئەو چوار سەرکردەیە بۆ ئەوەی دڵسۆزی خۆیان بۆ ئومەمییەت بسەلمێنن ڕێیان نەدا دەسەڵات دان بەو ڕێکخراوانەدا بنێ و لە ئەنجامیشدا لە ڕمبازێیەکی ئەسپی بارزانیدا لە سەرکردایەتی حیزب و دامودەزگای ڕۆژنامە وەلا نران و دەسەڵاتی کاروبار درایە دەستی کەسانی ترەوە کە جگە لە دوعای هیدایەت هیچی ترمان بۆیان نییە.

ئەوە وێنەیەکی زمانحاڵی ڕاستگۆی ناتەبایی و نەلوانە لە نێوان مارکسیزم و ئەو نەتەوایەتییەی تێکەڵی تان پۆی حیزبی کوردستانی بووە و ڕاست دەکا کاتێ دەڵێ چۆن حیزب لە پێناوی ئاڵووێری ئومەمییەتدا دەستبەرداری ئەو ئاڵووێرەی قەومەکەی خۆی دەبێ کە لە نووسینەکەی پێشترمدا باس کراوە و نووسەری خەبات بە ئاستێکی نزمی سەیرەوە کە لە وەهم و خەیاڵ دامێنترە لێکیداوەتەوە. خوایە قەومەکەم ببەخشە چونکە نازانن...

من بە خەونێکی ڕاست دەبینم کە خاڵی هاوبەشی مارکسێتی نێوان حیزبی شیوعی و هەر حیزبێکی تری بێ ئیجازەی ڕیزی شیوعییەتی نێودەوڵەتی وەک سنگەکەی مەلا نەسرەدینە لە ماڵی ئەو حیزبەدا. حیزبێک بە باڵای مەزەبێکدا هەڵبدا و پڕوپاگەندەی بۆ بکا کە لە سەر حیزبێکی تر تۆمار کراوە، وەک کەسێکە لە ساڵی برسێتیدا تۆوی خۆی لە ناو گوڵەگەنمی خەڵکی تردا بئاوڵێ، جا ئەی خەڵکی سەرکردایەتی و ئەندامەکانی خوارەوەی حیزبی کوردستانی ئەگەر لە خەون دەزانن خەونەکەم لێکدەنەوە؟؟؟

نووسینی مامۆستا هۆشیار (مەسعوود معەمەد)

## هەڵمەتی بەهێزکردنی برایەتی عارەب و کورد

دکتۆر عەبدلڕەزاق محیدین کە دەنووسێ ڕۆحی خۆی دەڕژێنێتە ناو مەرەکەبی قەڵەمەوە. ڕەنگە جار لە دوای جار شێوازی نووسینی بگۆڕێ بەڵام هەمیشە ئەو ڕاستگۆ و ڕوونەیە کە خوێنەرانی لە سەر ڕاهێناون. لە وەڵامە بەرزەکەیدا بۆ نامەکەی من و لە باسی پەیوەندی برایەتی و بەرژەوەندی نێوان عارەب و کورددا بەرجەستەبوونم هاتنە بەر چاو و لە هەموویان نایابتر لێکۆڵینەوەی زانستیانە و وابەستەبوونی بابەتیانە و خۆگریدانی بوو بە واقیعەوە.

ئەگەر نووسینێک ئەو خەسڵەتانەشی تێدا گرد بوونەوە، وردتر مەبەست دەپێکێ و باشتر ڕێگا ڕوون دەکاتەوە و باشتر بابەتێ لەخۆ دەگرێ کە خراوەتە بەر باس. گێڕانەوە و درێژەدان و شەرح و وردبوونەوەی لە چەند دێڕێکی کۆتایی گوتارەکەیدا کارێکی زۆر سەرنجڕاکێش و لەبەر دڵانە. ئەو بێپەردەییە تەواوەش کە لە باوەڕبەخۆبوونەوە لە هەرچی دەڵێ، سەرچاوەی گرتووە کارەکەی جوانتر کردووە و بە ڕاستی لەگەڵ هەستیاری بابەتەکەدا هاوسەنگ بووە. ئەوەندەی پەیوەندی بە منەوە هەیە بە باسە بابەتیانەکەی ڕێی وەلانانی قورساییەکی سەر شانمی خۆش کرد کە نەمدەزانی چۆن ئەو ئەرکە بەجێ بگەیەنم و بەرانبەر ئەو هەموو نەزاکەتەی ئەو و نووسەرانی ڕێزداری تر کە لە بەدواداچوون و نووسینەکانیاندا لە سەر بابەتەکەی من و لە سەر بابەتی برایەتی عارەب و کورد و بەرانبەر بە من نووسییان و دەریانبڕی، سوپاسی خۆم دەربڕم. ئەوانم دیت کەرەمێکی عارەبی وەهایان بە سەر مندا داباراند مەگەر کەسێک ئەوەی پێ بکرێ سەر بە نەتەوەیەک بێ کاری خۆی لە دەستی خۆیدا بێ و بتوانێ چاکە بکا و بەخشندە بێ. ئەی من چی بکەم کە سەر بە نەتەوەیەکم مێژوو باڵی شکاندووە و نافرێ و ئێستاش چوارپەلی بەستووە و نارِوا و چەوساندنەوە لۆژیکی مۆر کردووە و ڕێ دەرناکا

و تەماشاکەر چاو بە هەر لایەکی گەرمیان و کوێستانیدا بگێڕێ و ڕێبوار بە هەر دۆڵێکیدا بەرەو لووتکە هەڵگەڕێ یا بەرە هەڵدێر داگەڕێ، جگە لە کەلاکی ئاواتی پێکراو و خوێنی قارەمانی زامدارکراو و کەلاوەی بەڵگەی گەورەیی کارەسات، بەڵگەی ئیرادەی ژیان و پارێزگاری ماڵ و ماف نابینێ و هیچ دەرگایەکی هیوا لە بەردەمیدا، بەرەو ئێستا و پاشەڕۆژ ناکرێتەوە، ئاواتی هاولاتێتی عیراق نەبێ لە سەر بنەمای شەریکی لەگەڵ ئێوەی کوڕانی یەعروبدا کە بە دەستوور پارێزراوە و ڕێی تێ دەچێ زیاد بکا و پەرە بسێنێ، ناشڵێم ئەوە کەمە، بەلام جگە لەوە هیچ دەرگایەکی تر ناکرێتەوە. کەواتە جگە لە هەستکردنم بە چاکە هیچ کەرەسەیەکی ترم نییە چاکەی پێ بدەمەوە. ئەگەر ئەم بابەتییە دەستی بۆ دەستبەردان لە دەست بە سینگەوەگرتن و سوپاسکردن بۆ ئەو پێداهەڵدان و چاوتێری و دەرکەوتنی مەبەستە نەگرتبام، خۆم لە بارودۆخێکی زۆر سەختتردا دەدیتەوە. ئێستاش وا بە بێ ڕێوڕەسمی لەدەرگادان و ئیزنخوازی بە ژوور دەکەوم.

بەر لەوەی لە بەردەم خالّی وەلامەکاندا بوەستم پێم خۆشە جەنابی دکتۆر و سەرجەمی خوێنەرانیش لەگەڵیدا، ئاشنای بابەتێک بن کە لقێکە و لە برایەتی نێوان عارەب و کورد بۆتەوە و دەستەیەک لە نووسەران و جەماوەرێک لە ڕۆشنبیران بە بەدواداچوون و پشتگیریکردن ڕێیان بۆی خۆش کرد و بە دەنگیەوە هاتن، لایەنیش هەیە هەوڵی زۆر دەدەن بۆ ئەوەی وەهای بخەنە خەیاڵەوە و بە ئاماژە و ڕاگەیاندن دەسەلاتی نیشتمانیش وا تێبگەیەنن کە ئەم بابەتە پیلانێکی گەورەی لە بنەوەیە کە بۆ عیراقی عارەب و کورد وەیلە و ئەوەی سەیر و جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە پێچکردنەوە وا لە عەقڵ بکا پێی وابێ پیلان جگە لە لاپەڕەی ڕۆژنامە هیچ شوێنێک نادۆزێتەوە کاری خۆی تێدا بکا و دەلێی جیاوازی لە نێوان نەشرەی نهێنی و ڕۆژنامەی ڕەسمیدا ناکا کە یەکەمیان بانگەواز بۆ تێکدان و بشێوێنی دەکا و ئەوی تریان، هەر وشەیەکی بگری سەرچاوە و واتای ئاشکران. دوای ئەوەی خراپباسکردنی برایەتی عارەب و کورد، ئەو برایەتییەی بەرەو وێرانی و لاوازی برد، پیرۆزی

ئەرک ڕێگا نادا باسی بکەمەوە و بە لای ئەو قسە بۆشانەدا، هەر وا تێدەپەڕم و وەک توکلێک تەماشای دەکەم کە بە دەوری هەموو ناوکی میوەیەکەوە شەیتانۆکە هەیە و جەوهەریان دەیسەپێنێ.

ئەوجا، من جگە لە تاکەکەسێکی ئەو گەلە مافخوراوە خۆڕاگرە نیم و پێم وابوو بە نووسین و بە قسە بەرگری لە مافی دەکەم و ئەگەر کەسانێک بە دەورمدا تووڕە ببن و کەف بچڕێنن و خەڵکی تریش لە دوورەوە تووڕە ببن، کەف وشکایی دەبڕێ و ئەوەی بپەڕێتە سەر زەوی سوودی خەڵکی تێدایە.

داوا لە خۆم دەکەم ماوەیەک بە دیار هەندێ لەو خاڵانەوە بوەستم لە گوتارەکەتدا هاتوون.

باسی دواکەوتنی وەڵامی منت لە سەر یەکەم نووسینت کردووە کە تیایدا باسی کورد و حیزبە کوردییەکانت کردووە. لە ڕاستیدا ئەو وەڵامە ماوەی نیو مانگ لە لای خۆم مایەوە و چاوەڕوانی دەرکەوتنی دەکرد و بۆت نێردرا و جێیەکەتی هەڵە کرد و دوای چاوەڕوانییەکی زۆر وەک دیتت بڵاو کرایەوە.

بەڵام دوای ئەوەی ئەو دەرگایەی لێ کرایەوە و لە لای هەردوو گەل ناسرا، ئیتر بە نووسینی بە دوای یەکدا، زۆرکردنی خوێنەرم بە پێویست نەزانی تا ڕای خۆیان بڵێن بە تایبەتی لەبەر ئەوەی بابەتەکە، لە یەک کاتدا، هەم قووڵە هەم هەستیارە.

بۆچوونیش هەتا لە ناو خەڵکانێکی خاوەن بۆچووندا نەپاڵێورێ یا بە بەڵگەی گردەبڕەوە نەبێ، ناخرێتە بەر دەستی گەل. مەودادانیش بۆ بیرلێکردنەوە و لێتێگەیشتن و هەڵوێست، سوودی بەرچاوی هەیە، لە بەر ئەوە، بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم بابەتە چاوەڕوانیم پێ باشتر بوو تا بۆ ئەوەی پێشتر مەودای ڕادەربڕینی چاک یا خراپ و دەمەتەقێ برەخسێ و لە دڵاندا جێگیر بێ و کەس لە سەر نیەتی خۆی لێی نەڕوانێ. ئەم بابەتە بە قووڵی و فرەوانی خۆیەوە و بەو بەرکەوتنانەوە کە لە لایەن ڕەوت و لێکدانەوەی جیاوازەوە تووشی دەبن، دەشێ هەر لە کۆرپەییەوە قەڵەمی تێدا شەکەت بێ. باشتر وایە

دوای وردبوونەوەیەکی زۆر بۆچوون لە سەری دەربڕدرێ نەک بە بێ مەبەست زیان بە بەرژەوەندی بگەیەنێ، بە تایبەتی لەبەر ئەوەی خەڵکانێک لە کەمیندان بۆ لێکدانەوەی خراپ چ بەربەستێکیان لە بەردەمدا نییە.

لە بارەی شعوبیەتیشەوە، بە باسە ئەدەبییە مێژووییە نایابەکەت پەردەی ئاڵۆزیت لە سەری لابردووە، ئەگەرچی هەرگیز لە وشەیەک نەترساوم بە قەڵەم یا بە زاری تۆ یا ئەوانەدا بێ کە بە توانای بەرزیانەوە بە ئەدەبدا ڕۆچوونە و وەکو تۆ مافی زمانیان بە تەواوەتی داوە. بەڵام خەڵکانێک هەن توانای مەلەکردنیان نییە و باسکیان شل دەبێ و هەناسەبڕکێ دەیانگرێ و حەزیان لە داڕشتنی ساکارە بۆیە بازنەی واتایان بە بێ ئیرادە و شارەزایی بەرین دەبێ و لە چینەکانی وشە ئەوە دەبێ کە بقەیە بە زیاتر لە واتای خۆیەوە، بۆیە خۆلێلادانی دەوێ و ڕەنگە ئەوانەی ئەدەبی تۆیان هەیە و لە زەریای (ض)دا نقومن پێچەکانی داڕشتن شارەزا بن یا خۆیانی لێ بپارێزن.

لەو شوێنەدا کە لە قسان دەبمەوە و دەچمە سەر گلەیی کورد لە عارەب کە تیایدا پێ دەچێ هەڵوێستی ناحەزانەی هەبێ نەک دۆست، ئیزن لە دکتۆر دەخوازم کە بە کەیفی خۆم خشتەکانی بینای گوتارە بەرزەکەی ڕێکدەخەمەوە و ڕێ بە خۆم دەدەم بە پێی بەڵگەنەویست بڵێم لە هەر جێیەک هەڵوێست لە نێوان دوو لایەن گلەیی بوو، هەقە نیوەی قورساییەکە بخرێتە تای تەرازووی لایەنی لاواز و هاوتایان بکەی چونکە بە تەبیعەت لایەنی لاواز دەستی لەوە کورتترە مەودای گلەیی کەم بکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا بۆ عارەب شەرەفمەندییە جێگای لە دڵماندا جۆرێ بێ، لە سنووری گلەیی بوەستین، چونکە دراوسێیان هەیە لە خوێنی کورد و هەرچییەکی هیوا و کەرامەتی کوردی بە دەورەدا بخولێتەوە مڕ بوونە و ئەوجا بە هۆی شانازییانەوە بە تاوانکردن، لە سەر شێوەی شیعر و ئاواز و بەخۆداهەڵدان، هەرچی خوێنی کوردە هەڵیدێننەوە و ڕووی شانازی مێژوویی خۆیانی پێ ئەتک دەکەن کە ڕەگی مرۆڤایەتی پێدا نایەت و ناڕوات. کورتکردنەوەی ئەوەی لە نێوان ئێوە و ئێمەدا هەیە بۆ گلەییکردن هاندانێکی باشە بۆ نەهێشتنی هۆکاری گلەیی و

دواتریش بۆ سڕینەوەی شوێنەوارەکانی، کە ڕێی تێ دەچێ لە پەیوەندی نێوان دوو گەلدا هەبێ.

لە مرۆڤی وردبین شاراوە نییە سیاسەت و سیاسەتکردن و ئاستەکەی پەیوەندییەکی بەهێزیان لەگەڵ ئەم گەردە گلەییەی نێوان هەردوو گەلدا هەیە، چونکە لە ڕاستیدا سیاسەتمەداری عارەب و کورد، کارێکی هۆشەکی ئاڵۆز ئەنجام دەدەن و لە بەرگریکردنی سیاسیدا لە واقعێکی ئابووری و کۆمەلایەتی و مێژوویی و ڕۆشنبیری یەکێ لەو دوو گەلەدا و لە پەیوەندی ئەو گەلە بە ماف و ئەرکیەوە و لە سەر ئەوەی کێ قەرزاری کێیە و بەرجەستەکردنی واقیع کە ڕەنگە یەکێ بێ لە قورسترین ئەو کارانە کە مرۆ ئەنجامیان دەدا ئەگەر قورسترینیشیان نەبێ، زۆر ڕێی تێدەچێ تووشی هەڵە بن. هەر یەکە لە ئێمە ڕەنگە نەتوانێ لە بواری لاوازی داواکەر و داوالێکراودا داهێنان لە باسی مێشوولەشدا بکا چ بگا بەوەی لە باسێکدا هاوڕا بن کە پەیوەندی بە واقعی گەلێکەوە هەبێ خاوەنی نیشتمان و مەسەلە بێ و پەیوەندی لەگەڵ گەلێکدا هەبێ خاوەنی هەموو ئەو شتانە و زیاتریش بێ. هەموو کەسێک بە قەدەر یەک تێگەیشتن و زانست و ویژدانیان بەرانبەر ئەم ئەرکە ئاڵۆزە گەشە ناکات. پێگەیشتن لە تێگەیشتنی مرۆڤ ئەگەر ببێ، لە دوای تەمەنێکی دوور و درێژدا دەبێ و لە لای ئێمەش سیاسەت بە لای زۆرەوە کاری لاوان و منداڵانە و هەندێکیان وەک میوەی کاڵن، تام و بۆنیان پێنەگەیشتووە و پێوەدەدەن. ئەوجا سۆز دێت و قوڕەکە سەختتر دەکا و بارودۆخەکە ئاڵۆزتر دەکا و هەر بە سروشت خەونی پیران دەشێوێنێ و دەبێ چی لە چالاکی لاوان و هەرزەکاران بکا کە لە هەر یەکەیاندا بنەمای شانازیکردن بە ڕەگ و ڕچەڵەکەوە هەیە و وەهمیان پەتی لەخۆباییبوونیان درێژ دەکا و لە بازنەی دادپەروەری و ویژدان دەردەچن! ئەوجا دەست دەخاتە سەر دڵی وڵاتی کورد و دەڵێ ئەمە بەشێکە لە نیشتمانی عارەب. ئەوجا کوردیش کە هەستی بریندار بووە و سۆزی شێوێندراوە، دەست بۆ نیوەدوورگەی عارەبی درێژ دەکا و وەڵامی شەرفرۆشتنەکەی دەداتەوە و

ئەمەش شەڕەدەندووکی لێ پەیدا دەبێ و بۆ گەرمبوون ئامادە دەبێ. دەروونەکان لەم ڕۆژگارەدا خەسڵەتی دەمی تیغیان هەیە و کە بەر یەک دەکەون ئاگریان لێ دەبێتەوە.

حیزبی شیوعی، ئەو مارە ئۆینبازە بۆ فیتنەیی لە کەمیندایە و فوو بە پشکۆکەدا دەکا و تەڵە دەنێتەوە و لە شەڕیدا لەگەڵ قەومییەتی عارەبیدا فێڵ لە هەڵوێستی شەرمەزاربووی خۆی دەکا و کورد بەرەو ئەو بەرەیە ڕادەکێشێ کە شەڕی بۆ خۆی تێدا دەکا ئەوجا ئەو دروشمانە بەرز دەکاتەوە کە سۆزیان دەجووڵێنێ و گەشە بە هیوایان دەکا و دەیانداتە بەر ئەو تیرانەی عارەبی قەومی دەیانهاوێ تا هەستی کورد بریندار بێ و لە عارەب بەدەنگ بێن. ئەووەش فێڵێکە ئەگەر تا کۆتاییەکەی بڕۆیشتایە بە دڵنیاییەوە کاریگەری دەبوو و قسەی تۆ و من کاریگەری نەدەسڕییەوە و فێڵەکەش لایەنی خێری بۆ لایەنی فێڵلێکراو نەدەویست و بۆ بریندارکردنی مرۆ ئەوە بەسە هێرش بەریتە سەر پیرۆزییەکانی. باوک ئازاری خۆی بە ئازاردانی منداڵەکەی ناسڕێتەوە ئەگەر منداڵەکە بە باوەشی کەسێکی ترەوە بێ با ئەو کەسە سەر بە دوژمنیشی بێ لەبەر ئەوە نووسەری عارەب ئاگادار دەکەمەوە بەرد لەو دروشمە کوردییانە نەگرن کە بە عەموودی شیوعییەوە هەڵواسراون و شوێنە ئازاردیدەکانی کورد شارەزا بن و خۆتانی لێ لادەن چونکە ئەوە بۆ نزیکترین باوەڕهێنان و سۆزیشە.

ئەی عارەبەکان ئەگەر چاوتان بەکەسێ کەوت شەدەی بە سەرەوە بەستبوو و پشدێنی لە پشت کردبوو و کڵاشی لە پێدابوو، مافی برایەتی لە سەرتانە بە بێ پرسیارکردن لە باوەڕ و مەزەبە سیاسییەکەی، هەر لە جیاتی ئەو دروشمەی کە هەڵیگرتووە ڕێزی لێ بگرن و هەر دیمەنەکەی خەبەرلێدەرێتی و هەرزەکار و منداڵتان لە سەر ئەوە فێر بکەن و بەووەش برایەتی لەگەڵدا پتەو دەکەن و زمانی خراپەکاری دەبڕن و ناوی لێ بنێن هەڵمەتی «بەهێزکردنی برایەتی» یا هەر ناوێکی کە پێتان خۆشە و گوێم لێ بگرن من تەمێکەرێکی دەستپاکتانم.

تاوانی سیاسەت لە تێکدانی برایەتی نێوان ئەو دوو گەلەدا ئاشکرایە: ڕاستە سیاسەت لە ناو نەتەوە تازەپێگەیشتووەکاندا بەو شێوەیە نەبێ کاری پێ نەکراوە بەڵام ئەوەش ڕاستە و لە هەردوو ڕاستەکە گرنگترە کە جەماوەری بەرفرەوانی عارەب و کورد پرسیاری سۆز و هەڵچوونێک ناکەن گەنجە خوێندەوارەکانی دەیهێنن و ئەوەی کاری بانگێشەکەری بەهێزکردنی برایەتی نێوانیان ئاسان دەکا ئەوەیە کە ڕەگی ناکۆکی نەگەیشتۆتە ناخی ئەو دوو گەلە بەڵکو تایبەتمەندی ئەو توێژاڵە سەراو کەوتووەی سەر بەرژەوەندییە ڕاستەقینە جێگیرەکانیانە.

لێرەدا بەرپرسیارەتی ئەو پێشڕەوانە دەردەکەوێ و داوایان لێ دەکرێ ڕەفتاریان لەگەڵ بەرژەوەندی ئەو دوو گەلەدا بگونجێنن نەک بۆچوونی سۆزدارانەی خەیاڵی خۆیان بە سەر واقیعدا بسەپێنن و بڵێن ئەمە ئەو حەقەیە و بە سەر کات و شوێندا دەیسەپێنم و جەنابی دکتۆر، کاتێ بۆ تازەپێگەیشتوان ڕوونی دەکەمەوە چۆن دەوڵەتی نوێی عیراق لە دەوڵەتی داتەپیوی عوسمانی دابڕا و دامەزرا و کوردی ویلایەتی موسڵ بە باشتری زانی بچێتە پەنای عارەب نەک تورکەکان، بەم ئاگادارکردنەوەیە دەستێکی خێری وا بۆ بەرژەوەندی هەردوولا درێژ دەکەم، کە هەم سوپاسگوزارە و هەم وەبیر دێنێتەوە و لە ڕۆحێکەوە سەرچاوەی گرتووە ویژدانی لە سەر مۆر کراوە و ئەو هەستە بە سەریدا سەپاندووە کە شارەزای سەرچاوەی برایەتییە و دەزانێ لە کوێ بەرەکەت دەڕوێ. بۆ هەموو سیاسییەکان وا باشترە ئەو ڕێڕەوە واقعی و ویژدانییە بگرنە بەر چونکە ئەوەی مەبەستی دامێن نەبێ یا ئامانجێکی تایبەتی نەبێ بەرانبەر ڕەوایەتی لووتبەرز نابێ و لەو دوو خەسڵەتەشەوە تاریکی دزە دەکا، خۆ ئەگەر هەوەس دەستی بە سەر دەروونڈا گرت، ئیتر فاتیحا بۆ ئاشتی و تەبایی بخوێنە.

دکتۆر، بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ کوردی نانەتەوەییدا ڕووت وەرگێڕا و بیانووشت بۆ هەموو نارەزاییەک گردەبڕ بوو چونکە هەر لە بنەڕەتدا خۆت لە هاوکاری عارەبە ناقەومییەکان کشاندەوە و گەیشتنت بە ڕووناکی یەقین بە

بچڕاندنی هەموو پەیوەندییەک لەگەڵ ناقەومیدا جا چ عارەب و چ کورد، وەک بەری بەیانە کە داوی سپی لە تاریکایی شەودا دەردەخا.

کەسێ ڕێزی خۆی بگرێ و دڵنیابێ لە تێگەیشتندا بە هەڵەدا ناچێ، ڕێی نییە بەتەمابێ هاوکاری ناقەومییەک بۆ خزمەتێکی پاکی قەومێکی دیاریکراوی دوور لە ئومەمییەت بکا و بە لای منەوە کوردی ناقەومی بە حوکمی بەڵگەنەویست «ناکورد»ە چونکە لە سەر ئەوەشەوە بۆ بەرژەوەندی کورد خزمەتی قەومییە کوردەکان یا عارەبەکانی پێ ناکرێ ناتوانێ وەک کوردێک لەگەڵ خۆشیدا تەبابێ چونکە بە کۆکردنەوەی نەتەوایەتی و نانەتەوایەتی دڵەڕاوکێ ناخی بەرنادا ئەگەر دەستبەرداری یەکێکیان نەبێ: یا دەبێ بزوێنەری هەستی نەتەوایەتی کە پێخۆری لە ڕەگی چاکەکارییەوە دێ لە دڵ و هۆشیدا بسڕێتەوە و ببێتە ئومەمی و لە زەریای نێونەتەوەییدا بتوێتەوە و چ پەیوەندی بە نەتەوەکەی خۆیەوە نەمێنێ یا دەبێ پاڵنەری ئومەمییەت لە ناخی خۆی بسڕێتەوە و ویژدانی خۆی بۆ خزمەتی قەومەکەی خۆی پاک بکاتەوە و بێ ئەوەی سەیری هەستی شیوعییەتی نێودەوڵەتی و واسویسییەکانی بکا.

ناقەومی بە شێوەیەکی گشتی، ئەگەر لە ڕیزی حیزبێکی شیوعی دانپێدانراوی نێونەتەوەییدا بێ، هەموو دەروازەیەکی نەجاتبوون لە میللەتی خۆی دادەخا و یەک دەرگای بەرەو جیهانی شیوعییەت بۆ دەهێڵێتەوە و ئەگەر ئاواتی بەدی هات و خەونی لە پەیدابوونی سستەمی کۆمۆنیزمدا هاتە دی و دەسەڵات کەوتە دەستی خەڵکانی وەک خۆیەوە، کە دەربازبوون لە کۆنەپەرستی و دواکەوتووییدا دەبینن، هەموو سەرێکی ناشیوعی بپەڕێنی کە لە ئاستی هەژاری و نەزانی و نەخۆشی بەرزتر بێ.

بەڵام نانەتەوەیی لە ناو حیزبێکدا کە لە لایەن حیزبە شیوعییەکانەوە دانی پێدا نەنرابێ، هەموو دەرگاکانی بە بێ جیاوازی و بە تەواوەتی لە سەر دادەخرێ چونکە قەبووڵ ناکا بە هیچ دەرگایەکدا تێپەڕێ کە نەچێتە دنیای

ئومەمییەتەوە و بەوەش هەموو دەرگایەکی ناشیوعی لە سەر دادەخرێ و کۆمۆنیزمی جیهانیش ڕەتی دەکاتەوە دەرگایەکی پاڕانەوە بە ڕوویدا بکرێتەوە چونکە دەرگا لە دۆستی باوەڕپێکراو و دانپێدانراو نەبێ ناکاتەوە بۆیە دەرگای کۆمۆنیزمیش بە ڕوویدا دادەخرێ. ئیتر ململانێی قەومی و ناقەومی لە ناو حیزبدا دەست پێ دەکا و لە ناویدا ڕێ بە هاوڕایی و گونجانی نادا ئیتر هیچ یەکێ لەو دوو ڕەوتە گەشە ناکا و فرەوان نابێ. نهێنی نەزۆکی هەموو بزووتنەوەیەکی سیاسی بە ئاڕاستەیەکی دیاریکراودا نەشکێتەوە لەمەدایە و ڕاکێشانی هێز لە نێوان دوو ڕەوتی پێچەوانەی ناو یەک حیزبدا وا دەکا ئەو حیزبە لە ناو قۆزاخەی خۆیدا بمێنێتەوە و بە شتێک کە پێی دەڵێن «کاریگەری پێچەوانە» مەودا بۆ پەرەسەندنی وزەکانی ناهێڵێتەوە و ئەوەیش کوشندەترین دەرسی هەموو بزووتنەوەیەکی نەتەوەییە کە پەیام و ئامانجی هەبێ.

گەورەترین هەڵە کە قەومییەک ئەنجامی بدا هاوکاریکردنێتی لەگەڵ ناقەومیدا چونکە هاوکاریکردنە بۆ ڕووخاندنی ڕۆحی قەومی و سڕینەوەی لە هۆشدا و هاوکاریکردنیشە بۆ ڕێخۆشکردن لە بەردەم ناقەومی و پەیامە عەدەمییەکەی. ناقەومی بەوپەڕی ئاشکرایی، بە نووسین و قسە و کردار بە ڕووی هەموو دنیادا هاوار دەکا کە هاوکاری لەگەڵ چینە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵدا، لە پلە جیاوازەکانیدا هەیە تا دوایی پلە لە دوای پلە و باوەڕ لە دوای باوەڕدا بە سەریاندا زاڵ بێت و ئەوانە هاوکاری مەرحەلین و کۆتایی بە لەناوبردنی ئەو لایەنە دێ کە هاوکاری کردووە. بۆ قەومییەکان و هەموو ئەوانەی لە دەرەوەی ناقەومیدان شەریفتر و ئابڕوومەندانەترە بگۆڕێن و بە ئاشکرا ببنە ناقەومی نەک وەها هاوکارییان بکەن خۆیان و ئامانج و پەیامی خۆیان وێران بکەن.

ناقەومییە کوردەکان کاتێ دەڵێن پەیوەندی لە نێوانی مەسەلەی کورد و مەسەلەی گەلاندا دروست دەکەین و بەیانیان و ئێواران بە باسی قارەمانێتی کۆریا و ڤەنزوێللا و چین و سەرکەوتنی کوڵخۆز و سۆڤخۆز بۆ خزمەتی

سۆڤیەت بە گوێی کورددا دەدەن، فێڵێکی وایان کرد خەباتی کورد بخەنە خزمەتی ئومەمییەتەوە و تیایدا بیتوێننەوە و کاتێکیش لە هەموو ململانێکانی نێوان هەر دەوڵەتێک و دەوڵەتە ڕۆژاواییەکاندا بەو حیسابەی بە ناوی کوردەوە قسە دەکەن، خۆیان بە تەرەفی سێیەم دادەنێن و وەڵامی ئەو پرسیارەش نادەنەوە چۆن ئەو پەیوەندییە لە لایەن کوردەوە دروست دەبێ لە کاتێکدا لایەنی سێیەم وەڵامی داخوازییەکانی گەلی کورد ناداتەوە و وەکو گۆڕستان، یا وەک «ئەبولهەول» بێدەنگە و بۆ نموونە کورد بە گوتارێکی پڕ لە جنێو بە بەلجیکا و لە پشتی ئەویشەوە بە هەموو دەوڵەتە گەورەکانی ڕۆژاوا بە کۆنگۆوە وابەستە دەبێ لە کاتێکدا کۆنگۆ ناوی کوردی نەبیستبێ و ڕەنگە ئاگاشی لە پیتەکانی «ک و ر د» نەبێ و ڕێی تێ دەچێ ئەگەر بەرژەوەندی بخوازێ یا ناچار بێ لەگەڵ بەلجیکا و ئینگلۆ – ئەمەریکادا ڕێک بکەوێ و ئەوجا گفتوگۆ و هاوپەیمانێتی و نازانم چی لەگەڵدا دامەزرێنێ و ئەو جنێوانەش کە ئێمە بە بەلاش بە بەلجیکمان دا، لە بۆش بوەستن و کۆریا لە ناخەوە پێمان پێبکەنێ... «ئەی سەعد حوشتر ئاوها نالەوەڕێندرێ»

لەوە دەگەم ئێمەی کورد لە هەر دەوڵەتێکی ڕۆژهەڵات یا ڕۆژاوا ئەرکمانە بە دووی بەرژەوەندی کوردەوە بین و ئەرکی بەرابەریش لێمانی دەوێ بەرگری لە گەلێکی تر بکەین، لەوەش دەگەم ئەگەر ئەمەریکا دەستدرێژی کردە سەر کووبا بە سواری قامیش ململانێی سەرۆکی ئەمەریکا بکەین و شمشێری دار لە ڕووی هەڵکێشین بە مەرجێ ڕزگارکەری کوبا بە لای کەمەوە سوپاسێکمان بکا.

بەڵام ناقەومییەکان بە بیانووی تەقلیدی خۆیان لە شەرمەزاری دەبوێرن و گەلێ جار گوێمان لێیان بووە بۆ بێدەنگکردنی خەڵکی ساکار و بێدەسەڵات ئەوە دەڵێنەوە کە مادام گەلی کورد لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا قورسایی نییە و نەکەوتۆتە سەر پێی خۆی، با گەلانی تر، لە ناویشیاندا دەوڵەتە شیوعییەکان (مەبەستیش هەر ئەمەیانە) گلەیی ئەوەیان لێ نەکرێ کە لە مەسەلەی کورد بێدەنگن. من سەرم لە لۆژێکی خەڵکانێک سوڕ دەمێنێ لەگەڵ ئەوەشدا

قەومەکەیان لاواز و بێدەسەڵاتە، پێیان وایە دەتوانێ خزمەتی مەسەلەی دوور و نێزیک بکا، بەڵام لێی بە زیاد دەگرن لایەنگری دەسەڵاتدارێکی هەرە نێزیکی خۆی بێ و بۆ باوەڕهێنان بە گەلەکەیان بیانوو دەهێننەوە تا لە پێناوی بەرژەوەندی ئەوانەدا کە لە ئاستیدا بێدەنگن و گوێی پێ نادەن، لە سەر ناتەبایی بەردەوام بێ. سەیرترین شتی دنیای سیاسەت، نە بەڵکو هەموو دنیا ئەوەیە گەلێک بتوانێ ڕۆڵی خزمەکار یا حەرەس یا بەرگریکەر لە بەرژەوەندی خەڵک ببینێ، کە سەرهێشەی زۆر لەو کارانەدا هەیە، بەڵام نەتوانێ خزمەت بکرێ و چاودێری بکرێ و بەرگری لێ بکرێ، کە نە سەرهێشەی تێدا هەیە نە ماندووبوون.

ئەگەر سووربوونی ئێمەی کورد لە سەر پێداهەڵدانی گەلانی دنیا و بەپیرۆززانینی خەباتیان بێ ئەوەی بە هیچ شێوەیەک وەڵاممان بدەنەوە بەس بێ بۆ بەستنی پەیوەندی نێوان ئێمە و ئەوان کەواتە بۆ شاعیریش ئاسانە بە مانگدا هەڵبدا و بڵێ پەیوەندیم پێوەی هەیە و وەڵامی گردەبڕیش لە هەردوو بارەکەدا بێدەنگی تەواوی ئەو گەلانە و مانگە و دەستی کورد و شاعیرەکەش جگە لە هەندێ خەیاڵ هیچی تریان تێدا نییە. ڕەنگە هەبێ بڵێ گەلان لەگەڵ عاشقانی ئاسماندا بەراورد ناکرێن چونکە گەلان هەموویان لە سەر ئەرزن و شایستەی خۆشویستن و هاوسۆزین و منیش دەڵێم ئا ئەمە هی خەم و پەژارەیە چونکە گەلان خەڵکی زەوین و بەداخەوە حکوومەتیان هەیە و دەبیستێ و تێدەگا و زۆریشیان تێدەگەن و دەمانبینن بە شان و باڵیاندا هەڵدەدەین و بە پیرۆزیان دەزانین، ئەوجا لە ئاسماندا بێدەنگن و ناکەن چاکە بکەن و بە وشەیەک تەنها سوپاس و پێزانین دەربڕن.

جیاوازی نێوان نەتەوەیی و نانەتەوەیی لە باسی مەسەلەی گەلاندا ئەوەیە نەتەوەیی لە دەربڕینی نارەزایی بەرانبەر ئیستیعمار و دەستدرێژیکردندا خۆی و بەرژەوەندی گەلەکەی لە جیهانی شیوعییەتدا ناتوێنێتەوە و بە چاویلکەی ئومەمییەت لە مەسەلە جیهانییەکان ناڕوانێ بەڵکو بە پێی عەقڵ و ویژدانی لێیان دەڕوانێ و ئەگەر ناچاریش بێ مەیل و خۆشەویستی هەبێ، بەرەو ئەو

لایە دایدەشکێنێ کە بەرژەوەندی گەلەکەی خۆی تێدابێ. ئەگەر دیتیشی ڕووداوەکان پەیوەندییان بە بەرژەوەندی گەلەکەیەوە نییە، خۆی لەوە بەرزتر ڕادەگرێ ببێ بە کەرەنای ئومەمییەت، بەڵکو ڕێزی خۆی دەگرێ و ئەوە دەڵێ کە شایستەی بێلایەنێکی بەڕێز بێ. بۆ نموونە، ئەگەر هند و چین ناکۆکییان ببێ و گەلەکەی یەک جۆرە پەیوەندی بە هەردوو لایانەوە هەبێ باشتر ئەوەیە بێلایەن بێ و قسەی ئاشتەوایی و ڕێککەوتن لە نێوانیاندا بکا. ئەگەر لایەکی بە دەستدرێژکەر زانی با نەسیحەتی بکا و ڕەخنەی لێ بگرێ. بەڵام بێت و ببێ بە تەرەفی سێیەمی ململانێکە و بە بێ هیچ هۆکارێکی دیار مل بە لایەکیانەوە بنێ، ئەوە کاری کرێگرتەیە و کرێی دراوە، واتە ململانێیەکە بە پارە دەنا شێتییەکی سووکە.

لە پشتگیریکردنی کۆمۆنیزمی جیهانیدا ئەو بیانووەی بۆ کۆمۆنستی دانپێدانراو هەیە، بە هیچ جۆرێ بۆ قەومییەک یا کۆمۆنستێکی دانپێدانەنراو نییە چونکە کۆمۆنستی تەواو کرێی لایەنگرییەکەی، بە لایەنگری بێ یا هاوکاری ماددی، هەر لە پێشەوە وەرگرتووە و لە پاشەڕۆژیشدا لە کۆمۆنیزمی جیهانی وەریدەگرێ و ئەگەر لەگەڵ قەومی یا کۆمۆنستی ناتەواوی گەلێکدا ناتەبا بێ، هەموو دنیای کۆمۆنیزم بە تەواوەتی لەگەڵیدا دەبێ.

ئەی ئەگەر قەومی یا کۆمۆنستێکی دانپێدانەنراو خۆی بخاتە خزمەتی ڕۆژهەڵاتەوە و چەکی سپی بۆ ئیمزا بکا، چاوەڕوانی چی دەکا؟

ئای کورد چەند پێویستی بەوەیە بە گڵۆپ لە بەر دەرگای ماڵەکەی ئەم گوتە بەنرخە بنووسێ «گەلی کورد باوەڕی بە خۆی و مافەکانی خۆی هەیە و بە قەدەر ئەو ڕێزەی لێی دەگیرێ ڕێزی گەلان دەگرێ».

ئەگەر هاوکاریکردنی ناقەومییە کوردەکان ڕەت بکەیتەوە نە لۆمەی خۆت دەکرێ نە قەومەکەت چونکە وەکی تر هیوایەکی بێئەنجامە و عارەبایەتی هیچی بۆ کورد و مەسەلەکەی لەوە خراپتر دەست ناکەوێ کورد بەرەو ناقەومێتی هان بدا چونکە بەوە لە گەوهەربەستی و چلوورەبەستن بە دەوری

کەسایەتی و زات و بەرژەوەندی خۆیدا بێبەشی دەکا و دەیداتە دەست ئاڵۆزی و هەڵوەشانەوەی بەر با و گەردەلوولی چینایەتی و ئومەمییەتەوە.

پێم خۆشە وەڵامی سەرنجی ئەو بەڕێزانە بدەمەوە کە لە هەندێ لە نووسینەکاندا، لە سەر بابەتەکەی من هاتوون. ناکرێ یەک وەڵام بۆ هەموو سەرنج و بۆچوونەکان هەبێ بۆیە هەندێ لەو خاڵانە هەڵدەبژێرم کە سوودیان بۆ بابەتەکە زیاترە، ئەوەش لە پێناسەکردنی عارەبایەتی بۆ کاروباری کورد لە ڕووە ئاشکراکانیەوە. ئاماژەی یەکێ لەو بەڕێزانە بۆ هاوکاریکردنی جاروباری نێوان پارتی دیموکرات و شیوعییەکانە، بۆی ڕوون دەکەمەوە کە هاوکاری لە نێوان کۆمۆنست و جەماوەری پارتیدا لە پەرەسەندندا نییە و گشتیش نییە و تەنها لە بوارێکی بەرتەسکدا لە ئارادایە.

هۆکاریش ئەوەیە کە پارتییەکان لە هەڵبژاردندا شکستیان پێ چاکترە لەوەی بە هاوکاری شیوعییەکان و ڕێکەوتن لەگەڵیاندا سەرکەوتوو بن چونکە دوای ئەوەی شیوعییەکان دەستیان بە سەر سەرکردایەتی فیرقەی دووی کەرکووکدا گرت و ئەوانیان ئازاردا، حەزیان بە ڕووبەڕوو بوونەوەیان هەیە. ئاسانیش نییە ئەو باجە قورسەیان لە بیر بچێتەوە کە بە کەرامەت و ئازادی و پیرۆزییەکان و کیانی حیزبەکەیان دایان کاتێ حیزبی شیوعی تەماحی پێیان بوو و بە هەر شێوەیەک کە بە بیری نەخۆشدا دێ، تۆوی لەناوچوون و سڕینەوەیان لە ناودا چاندن. بە تۆمەتی جاسووسێتی بۆ ئەمەریکا و بەریتانیا و پەیمانی ناوەندی تاوانباریان کردن و کلکایەتی پیاوانی سەردەمی لەناوچوو و جوداخوازی و دابڕاندنی ڕیزی نیشتیمانی و پیلانگێڕی و کۆنەپەرستی و خزمەتی دەرەبەگ و خیانەت کردن لە بەرژەوەندی پرۆلیتاریا و گەلی کورد درانە پاڵیان و هەواڵی وایان لە سەریان گەیاندە حکوومەت ئەگەر بسەپێ سزای زۆر توندی هەیە، زۆریان گیران و زۆریان ئاوارە کران و سووکایەتی بە زۆریان بە بێ جیاوازی لە تەوقی سەرەوە تا بنی پێ کرا. شەڕی کۆمۆنستەکان لە دژی پارتی لە زیادبوونی بەردەوامدا بوو و دەیانویست بە یەکەم جار بە تواندنەوە و لەناوبردن بە سەریاندا زاڵ بن و کاتێکیش

دەسەڵات دەگرنە دەست بە جارێ نەیانهێڵن. خەڵک بە چاوی خۆیان دیویانە خەنجەری کۆمۆنستەکان لە کێلان دەرهێندراون و بە هەناوی پارتییەکاندا کراون ئەگەر هەمان نارەزاییان بووبێ. شیوعییەکان لە هەموو شار و گوندێکی کورددا بە هەموو شێوازێکی خۆئامادەکردن و شەڕفرۆشتن، بە سووکایەتی و دڕاندنی دروشم و جنێودان بە پیرۆزییەکانی پارتییەکان و هێرشکردنە سەر بارەگا و دەستبەسەرداگرتنی ماڵ و سووککرنی دروشم، دەیانویست بیانهێننە شەڕێکەوە کە پێشەکی خۆیانیان بۆ ئامادە کردبوو و سەرکەوتنیان مسۆگەر کردبوو تا وەکو قوربانی سەریان ببڕن. بەڵام پارتییەکان لە لەناوچوونی خۆیان و شکست دڵنیا بوون و دەیانزانی دەسەڵاتی ناوچەیی بە ئاشکرا، چ بە قسە و چ بە کردار پشتگیری کۆمۆنستەکانن و کۆمۆنستەکان هەموو جۆرە چەکێکیان هەیە و هەموو بزاوتنێکی بەرهەڵستکارانەی پارتی وا لێک دەدرایەوە کە پیلان و یاخیبوون بێ لە حکوومەت و ئەوەش بە دڵنیایی بۆیان دەبووە کارەساتی کوشندە و دەیهاڕین و پەرتوبڵاوی دەکردنەوە بۆیە هەرچۆنێ بێ لە سەر حیسابی کەرامەت و هەستی خۆیان دانیان بە خۆدا گرت. ئەوەی زیاتر برینیانی دەهێنایە سوێ، ئەوە بوو کە شیوعییەکان بەرەڵاترین و سووکترین کەسی وایان دەکردە چاودێر بە سەر مەزنترین پارتییەوە کە چەندین پلە لە خوار مرۆڤەوە بوون و بەرەو دەرەکی بێبەهایی و تاوانکاری شۆڕ ببوونەوە بەڵام پارتییەکان بە ناچاری قووتیان دەدایەوە و لە کاتێکدا ناخیان قێزی دەهاتەوە، جگە لە کەشتی خۆڕاگری هیچی تریان نەبوو بۆیە دانیان بەخۆدا گرت. پارتییەکان بە هۆی تاقیکردنەوەی تاڵیانەوە لەگەڵ کۆمۆنستەکاندا تا پێیان کرابێ هاوکاریکردنیان پێ خۆش نەبوو و لە نێوان ڕەتکردنەوە و قەبوولکردندا هەڵبژاردنیان نەبوو بۆیە بۆ کۆمەڵەی جووتیاران لە لیوای سلێمانی و کەرکووک و هەولێر بە لستی سەربەخۆ دابەزین و لە موسڵیش نازانم چۆن بوو و بە هەموو جۆرێک هاوکاری ئەوانیان ڕەت کردەوە. لە هەولێر و کەرکووک شەرەفی دۆڕاندنیان بەدەست هێنا و لە سلێمانیش بە ململانێی شەرەفمەندانە و بەدەستهێنانی ئەنجام سەرکەوتن و

دۆڕاندن و سەرکەوتن لەم ململانێیەدا چیرۆکی خۆیان هەیە و ئەم بوارە جێی باسکردنیان نییە. هەڵوێستیان لە نقابەی مامۆستایان لە هەموو شوێنەکاندا نە یەکگرتوو بوو نە هەڵکشاو لە سلێمانی هاوکارییان ڕەت کردەوە و لە کەرکووک قەبووڵیان کرد و لە هەولێریش لە نێوان قەبووڵکردن و ڕەتکردنەوەدابوو و بە ئاشکرا نە ململانێ هەبوو نە هاوکاری، بەڵکو تێکەڵەیەک بوو لە ناتەبایی هەڵوێست کە بارودۆخی خولقاندبووی نە پێشی پێ دەگیرا و نە سنووردار دەکرا، ڕەگی دەگەڕایەوە بۆ بەغدا و بۆ سیاسەتی وەزارەتی مەعارف و هەڵوێستی قەومییە عارەبەکان بەرانبەر داخوازییەکانی کورد بە گشتی تا دوا هەڵبژاردنی چەند مانگێک پێشتر کە نزیکە ساڵێک پڕ بکاتەوە. ئەم ئاڵۆزکاریانە لە دنیای سیاسەتدا حوکمی خۆیان هەیە و دەشێ ئەمڕۆ شتێ لەدایک بێ و سبەینێ پێچەوانەکەی بێتە دنیاوە. ئەو هەواڵەم پێ گەیشت کە مامۆستا قەومییە عارەبەکان لە سلێمانی هاوکاری کۆمۆنستەکانیان کردووە و دەنگیان بە لستی دژی پارتی داوە و گومانی ناوێ کە پەیوەندی پارتی بە شیوعییەکانەوە، لەو ناوچانەدا کە کوردنشینی تەواون لەگەڵ ئەو ناوچانەدا کە تورکمان یا عارەب لەگەڵ کورددا لە خۆ دەگرن جیاوازیەکی ئاشکرا هەیە و لە هەر شوێنێک کە ململانێ تەنها لە نێوان پارتی و شیوعییە کوردەکاندا بێ لێکحاڵیبوون دەگاتە ئاستی مەحاڵ و ڕەنگە شیوعییەکان بۆ زەرووەتی کاتی بیانەوێ نێزیکبوونەوە هەبێ بەڵام پارتییەکان هەموو جۆرە هاوکارییەک ڕەت دەکەنەوە مەگەر لە سەرکردایەتییەوە یا لە لیژنە ناوچەییەکانەوە فەرمانیان بۆ بچێ کە مافی ڤیتۆ قەبووڵ ناکەن یا پێداویستی ماددی لە دەسەڵات بەدەر بیسەپێنێ، وەک لە کۆنگرەی مامۆستایانی کورددا، پار و پەر لە چەند ڕۆژێکیش ڕوویدا بەڵام ئەم جۆرە لێکنزیکبوونەوانەی نێوان جەماوەری پارتی و شیوعی بە حوکمی ناچاری و بارودۆخێک دەبێ کە چارەسەری نەبێ. لە کەرکووک و چەند شارێکی تر کە کورد لەگەڵ تورکمان و قەومی تردا دەژین دژەکوردی وەها تەشەنەی کردووە گەیشتۆتە ئەوەی هەموو کوردێک بە کۆمۆنست بزاندرێ. بە داخەوە

سەرەتای سووربوون لە سەر ئەم خەسڵەتە نەزۆکە لە برا تورکمانەکان بەدی دەکەین. من پارتییەکان لە هەڵە بەدەرناکەم، ئەوەی بڵێ بێهەڵەم «وشە زل دەکا» بەڵام ئەوەش زوڵمێکی ئاشکرایە هەڵوێستی مەردانەیان بەرانبەر تورکمان، چ لە کاتی قەسابخانەکەی پاردا چ لە هەموو هەڵوێستێکدا پێویست بووبێ بەرانبەر قەومەکانی تری عیراق هەست دەرببڕدرێ، تۆمەتبار بکرێن. گومانی ناوێ بانگێشەی تورکمان بۆ ئەوەی هەموو کوردێک بە شیوعی بزاندرێ پارتی و کورد ناچار دەکا لە شیوعییەکان نزیک ببنەوە. ڕەنگە هەبێ بڵێ ئەوە پەنابردنە بۆ گەرما لە دەست ئاگر. منیش دەڵێم کورد لەوەدا چی پێ دەکرێ و کێ لە دەست ئاگر پەنا بۆ گەرما نابا؟ دوور نییە مەترسییەکی کەم وا لە کەسێ بکا لە بەرزاییەوە خۆی هەڵدا و ملی خۆی بشکێنێ. سروشتی مرۆ ئەوەیە لە دەست مەترسی ڕاستەوخۆ ڕابکا ئەگەرچی ڕاکردنەکە بەرەو مەترسییەکی گەورەتریش بێ. ئەوە کاری خوایە و کاری خوا دەستکاری ناکرێ. ڕەنگە ئەوە ڕوون بێ تۆمەتبارکردنی هەموو کورد بە شیوعییەت لە مەودای نێزیکدا هەندێ غەرەزی ناحەزایەتی بەدی بێنێ، بەڵام لە مەودای دووردا نوقمی نەفامییە چونکە ڕێگا بۆ دوژمنایەتی کورد و تورکمان خۆش دەکا و ڕێگای ئەوەش نییە ئەو دوژمنایەتییە کورد لە ڕەگدا دەربێنێ. ڕۆژگاری ناتەباییش ڕۆژێ بۆ تۆیە و ڕۆژێکیش لە دژی تۆیە و ناکرێ هەتا هەتا پەنا بۆ خەتی لایەنگر ببردرێ. ئێمە گەرمترین تکامان ئەوەیە لای پایەدارە تورکمانەکان، حیکمەت بە سەر فوو لە ئاگرکردنی هەندێ لێقەوماو زاڵ بێ و بە نەسیحەتی چاکە بەرپەرچی فووکردنیان بدەنەوە. مرۆڤی بەویژدان لە بارودۆخیان دەگا و ئاگای لە ئاستی ئازاریان هەیە و لەو خەمەدا هاوبەشیانین، لەگەڵ ئەوەشدا لە سەر ئاشتبوونەوەیان لەگەڵ کورددا سوورین کە لە ڕاستیدا، بە هیچ جۆرێ وا نییە کینە لە یەکتر هەڵگرن چونکە کوردەکان جگە لە خۆشەویستی و ڕێز هیچیان لە دڵدا نییە. ئەگەر شتێکیش شک دەبەن هی گلەیی بێ با باسی بکەن تا لەگەڵیاندا

هاوکاری نەهێشتنی بین ئەگەر نەشمانکرد مەودای گلەیی بە فرەوانی لە بەردەمیاندا دەمێنێ و خوا باوەڕداران لە ناکۆکی بپارێزێ.

بەڵام لە بەغدا کە چەقی قورسایی سیاسەت و ئاڕاستەکاری و ڕۆشنبیرییە، پارتییەکان تیایدا بارودۆخێک دەبینن کە ئاسان نییە، بە تایبەتی زۆربەیان خوێندکارانی پەیمانگا باڵاکانن و پەیوەندییان سنووردارە لەگەڵ خوێندکارە هاوتەمەنەکانی خۆیاندا بەڵام کۆمۆنستەکان ڕەوتی قەومی عارەبی دەقۆزنەوە کە لە هەموو ماڵ و کۆڵان و گەڕەک و شەقامێکدا هەیە بۆ هەڕەشەکردن لە قەومییە کوردەکان و ئاماژەیان پێ دەدەن. بەڵام ئەوانەی سەر بە قەومی عارەبین پڕن لە سۆز و ڕاپەڕین و لە هەموو شتێکی ناعارەبی لالووتن ئەوەش لە ئەنجامی کاردانەوەی ئەوەی بە سەر قەوم و باوەڕ و پیرۆزیەکانیاندا بە هۆی هەڵمەتی توندی شیوعییەکانەوە هاتووە و بە هۆی ناسکی تەمەن و کەمیی تاقیکردنەوەیانەوە تێگەیشتنێکی قووڵی پارێزراویان بەرانبەر توندی دەسەڵات نییە و ئەوەندەی گلەیی لەو بارودۆخە دەکرێ کە تێیکەوتوون گلەیی لە هەڵمەتیان ناکرێ و دەروونم بۆ ئەوە پاڵم پێوە دەنێ کە لۆمەی پەروەردەکارانیان بکەم. با لە بیرمان بێ ئەو پارتیانەی لە بەغدا یا لە شاری تری زۆرینە عارەبدا دەژین بە گوێرەی کەمیی ژمارەیان و غەریبییانەوە و لە دەریای عارەبدا چەند دڵۆپێکی گەنجی کوردن و باوەڕ ناکرێ لە باری هێرشبردندا بن و ئەوپەڕەکەی بشێ وەک لۆمە ئاڕاستەیان بکرێ هەر ئەوەیە کە هەڵوێستی سیاسی وایان هەیە هەستی عارەبە قەومییەکان ڕازی ناکا ئەگەرچی ئەوەیان بە سەردا سەپاوە و پاڵیان پێوە نراوە، ئەوەش لە ئەنجامی توندوتیژی قەومییە عارەبەکانەوە جا لە ناو خوێندکارەکاندا بێ یا دەرەوەی بازنەی ئەوان. سا برا قەومیە عارەبەکان با لەگەڵ یەکدا قسەمان ڕوون بێ، کوا لایەنگری ڕابردووتان لە داواکانی گەلی کورد و مافەکانی و ئەی کوا پێشوازیتان لە پەرەسەندنی هەستی کوردبوون و پشتگیریتان لە گەشەکردنی؟ ئەم ڕۆژنامە و ئەو پەیرەو و بەرنامانە ڕۆژێ لە ڕۆژان قسەیەکی ڕەوانی وای لەخۆ نەگرت لە سەر دڵی گەرممان بە فێنکی و ئاشتی بنیشێ، مەگەر لە

یادەوەرییە دەگمەنەکانماندا و هاواری من کە لە سەرەتای قسانداندا ئاڕاستەم کردن ئەوە نەبوو ویژدانتانی پێ بهەژێنم: ڕێزی پیرۆزی و جەژن و شانازییە مێژووییەکانمان بگرن چونکە ئێمەش وەک ئێوە مرۆڤین و هەر کەسێ پارێزگاری لە کەرامەتمان بکا پێمان خۆشە. ئەو هاوارەم لەخۆڕا بوو چونکە دەزانم کورد چەند بۆ بەشداریکردنی خەڵکی تر لە هەستگۆڕینەوەدا تێنووە. وەک من هەستی پێ دەکەم ئێوەش هەستتان پێی بکردایە لە کانییەکانی سۆزی عارەبییەوە چەندین چاوگتان دەتەقاندەوە و سۆز و بەزەیی و خۆشەویستییان لێوە هەڵدەڕژان بەڵام دوای ئەوەش شتی وا دەکەن؟ ئایە ڕێمان هەیە بە تەمای بەدەنگەوەهاتنی ڕاستگۆیانە بین بۆ هیواکانی براکانتان لە ئاین و نیشتماندا، وەک هاوڕێکەتان نموونەیەکی زندووی هێنایەوە کە پەیامی مرۆڤایەتی لە بارەی قەومەکەیەوە چۆن بێ. کوردیش بە حوکمی مێژووە بە سەردا سەپاوەکەی چاوەڕوانی چاکەن تا بە درێژایی ڕۆژگار بیپارێزن و هەر بابەتێک لە میتاڵی وەفای کورد دروست بکەن، بە زایەع ناچێ و بۆچی تاقی ناکەنەوە؟.

ئەوانە هەندێ بارودۆخ و کارتێکەرن کە وا دەکەن پارتییە قەومییەکان لە کەشوهەوای ناکوردیدا، بە ناچاری لە کۆمۆنستەکان نێزیک ببنەوە و ویژدانیش نەختێ ڕێیان دەدا و کلیلی چارەسەری کێشەکەش لە لای کورد نییە. ناشکرێ بەم پەلەیە هەموو خاڵە ناڕوونەکان بخەینە ڕوو بەڵام زەحمەت نییە هەر خاڵێکی کە خوێنەر دەیەوێ، بخرێتە بەر باس. ئەم ڕوونییەش لە بەرژەوەندی هەموو لایەکدایە و دڵسۆزان لێی بێزار نابن.

ئاماژەیەکی تری هەمان بەڕێزم بینی کە تەشەنەکردنی کۆمۆنیزم لە ناو کورددا بۆ هۆکاری ئابووری دەگێڕێتەوە. لە سەرەتاوە ئەوە دەڵێم ئەگەرچی کۆمۆنیزم ڕێی خۆی لە ناوچە کوردیەکاندا کردۆتەوە بەڵام ئەگەر بە ڕۆژانی گەشەکردنی پێوانەی بکەین لە کزیی داوە و وای لێ هاتووە، یا خەریکە وای لێ بێ لە هەندێ ناوچەی عەشایەری قەتیس بمێنێ ئەوەش بە هۆی بەرگریکردنی توندی ڕۆڵەکانیان لە خۆیان و پیرۆزییەکانیان. ئەوەی لە کۆی

کاریگەری ئابووریدا دەیبینم، ئەگەرچی بۆ تەشەنەکردنی کۆمۆنیزم لە ناو خەڵکە هەژارەکەدا ئەوە لێکدەدرێتەوە، بەڵام ناتوانێ ببێتە هۆکاری بڵاوبوونەوەی لە ناو ڕۆشنبیر و خوێندکاران و مامۆستایاندا، کە خەڵکانێکن خەسڵەتی هەژاری نایانگرێتەوە و زۆر لەوانە پلەوپایە و مەعاش و داهاتی تایبەت بە خۆیان هەیە و دەیانخاتە ڕیزی دەوڵەمەندانەوە. ئەو بیانووەی کە دەڵێ ئەوانە بەرژەوەندی خۆیان بە بەرژەوەندی پرۆلیتارەوە بەستووە، بیانوویەکە بە پێی بنەماکانی مارکسیزم خۆی کە بە پێی بەرژەوەندی ڕووداو و دیاردەکان لێکدەداتەوە، بەرپەرچدراوەیە. بە پێی حوکمی ئەو تیۆرییە، چاوەڕوان ناکرێ کۆمۆنیزم لە ناو خواپێداوان و تێروتەسەلەکاندا پەیدابێ یا تەشەنە بکا ئەوجا بۆ چینە هەژارەکان بگوازرێتەوە. من لە بارێکدا نیم ڕێم هەبێ قسە لە سەر هەندێ بۆچوونی مێژوویی شیوعییەکان بکەم کە دەڵێ پێویستە خەڵکانێکی بۆرژوای ڕۆشنبیری وا ڕابەرایەتی پرۆلیتار بگرنە دەست کە لە ئیشتراکییەتی زانستی و کۆمۆنیزم دەگەن و ئەو ڕاپەڕینە بێئامانجەی کرێکاران کە بەرەو پێکهێنانی کۆمیتەی بازرگانی دەڕوا، ئاڕاستە دەکەن و بەرەو تێکۆشانی شۆڕشگێڕی ئومەمییەتی دەبەن... بەو بیانووانەی کە لە کتێبەکانیاندا باس کراون و ئێرە جێی باسکردنیان نییە و دوای باسی دوور و درێژ هەر لە خاڵی دەستپێکدا دەمێنین کە گوتمان ناتەباییی لە نێوان کۆمۆنیزم و کەشوهەوای پەیدابوونیدا لە ناو دەوڵەمەندەکاندا، لەگەڵ بنەماکانی مارکسیزمدا هەیە. هەر دەبێ پەنا بۆ شتێکی تر بەرین نەک کاریگەری ئابووری کە ئەم بارودۆخە سەرەوخوارە ڕوون بکاتەوە، بەڵام پێم وا نییە ئێرە جێیەکی گونجاو بێ بۆ ئەوەی بە پێی باوەڕی خۆم لێکدانەوەی بۆ بکەم و دێمەوە سەر باسی ئەو ڕێچکە سیاسییانەی لە ناو کوردا کاریگەرییان هەیە.

گەلی کورد لە عیراقدا باوەڕی پتەوی بە شۆڕشی تەمموز هەیە، باوەڕێک کە سەرچاوەیەکی پاکی گەلێک لە گەلانی هەیە و کورد یەک بە خۆی باوەڕی بەشۆڕشگێڕی هەیە و دەیەوێ لەو ڕێگایەوە سەرفرازی بە دەست

بهێنێ. شۆڕشی تەممووزیش بەرەو ڕووی دەسەڵاتێک بەرپا بوو کە لە سەر چەوسانەوەی کورد و هاوپەیمانێتی لەگەڵ هێز و وڵاتگەلێکدا هەبوو کە وڵاتیانیان دابەش کردبوو و مافیانیان زەوت کردبوو بۆیە شۆڕشەکەیان بەر لە هەموو کەس بە هی خۆیان زانی. ئا ئەوەیە نهێنی لایەنگریی بێ ئەملاوئەولای کورد لە شۆڕشەکە و هەر وەها بە لایەنگریشی دەمێنێتەوە. لایەنگرییەکەی شێوە و جەوهەری شۆڕش دەگرێتەوە و ئەوەش لایەنگریکردنی سروشتی دیموکراتییە و کە لە دروسبوونیەوە لە ناخیدایە و ئەوەش دەرگای نهێنی هەندێ لە هەڵوێستەکانی کورد بە هەڵە دەکاتەوە و هۆکاریش تێکەڵکردنی بۆچوونەکان و نەمانی سنوور و جیاوازی نێوانیانە بۆیە شیوعیەکان زۆری نەمابوو بانگێشەی دیموکراسی بکەنە هی خۆیان تا ئەوەی واتای کۆمۆنیزم لە زەیندا وەک ناوی دیموکراتی لێ هاتووە. لایەنگری کورد لە دەستکەوت و ئەو ڕێکخراوانەی لە سەردەمی کۆماریدا بە ناوی دیموکراتییەوە پەیدابوون وا لێکدرایەوە کە لایەنگریکردنی کۆمۆنیستەکان بێ چونکە کۆمۆنستەکان لە سەر هەموو دەستکەوتێک ئاڵایەکی سووریان بەرز کردەوە. قەت کورد لە بارێکدا نەبووە بۆی ئاسان بێ جێبەجێکردن ڕەت بکاتەوە و بنەما قەبووڵ بکا. با لەبیریشمان بێ کورد چەند هیوای بەرز بێ و ئاواتی لەگەڵ خەونی تەمادا بسووڕێنەوە پەنا بۆ ئەم هێلانەی هاونیشتمانییەی عیراقی تەمووز دەبا لەگەڵ برا عارەبەکانیدا و لە ڕۆژی ئەمڕۆ و لەم بارەدا پشتگرێکی تر شک نابەن لەبەر ئەوە بەلایانەوە ناخۆشە هەڵوێستێکیان هەبێ دژی هەر ئەرکێک بێ کە بە ناوی شۆڕشەوە بە سەریاندا بدرێ. ئەوەی لە نزیکەوە ئاگادار نەبێ نازانێ قەومییە کوردەکان کاتێ ملکەچی ڕێنمایی هەندێ فەرمانبەر دەبن کە لە فەلەکی کۆمۆنستەکاندا دەخولێنەوە، چەند ئازار دەبینن تا گومانی بێوەفاییان بەرانبەر جمهورییەت لێ نەکرێ.

دڵسۆزی پارتییەکان بۆ جمهورییەت گەیشتۆتە ئاستی ئەویندارى: لەو سەردەمەدا کە دەسەڵاتی کۆمۆنستەکان گەیشتبووە چڵەپۆپە و دەستیان بە سەر شارەکاندا گرت و لە گوندەکانیش لە هەموو لاوە پەیدا دەبوون، زۆری

نەمابوو کوردستانییەکان لە ڕەوینەوەی هەوری سەر دڵیان بێئومێد بن و مەترسی لەناوچوون زیادی کرد و پەلەوەری مەرگ بە دەوری سەریاندا دەخولایەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یەک پارتی کوردستانی لە ترسی مردن سنووری وڵاتی نەبڕی و نەچووە دەرەوەی وڵات و پێیان باشتر بوو لە عیراقی تەمووزدا شەهید بن ئەگەرچی کۆمۆنستەکان بۆ ڕاکردن بۆ دەرەوەی عیراق پاڵیشیان پێوە دەنان تا لە کۆڵیان ببنەوە و تۆمەتی خیانەتیشیان پێوە بلکێنن بەڵام هەوڵەکانیان لە سەر بەردی دڵسۆزی پارتی بۆ نیشتمان تێکشکان. پارتی پەنای بۆ شاخ دەبرد تا مەترسی کۆمۆنستەکان لە کۆڵی خۆی بکاتەوە و ئەگەر پێی ڕابگەیەندرایە کە بە فەرمانی ڕەسمی حکوومەتی شۆڕش، بە هۆی خەبەرلێدانی شیوعییەکانەوە، داوا کراوە، بێ ئەوەی بزانێ چارەنووسی بە چی دەگا، خۆی دەدایە دەستی دەسەڵاتەوە.

لەو وردە سەرنجانەوە دەردەکەوێ بۆچی کورد بە بۆیەی کۆمۆنیزم ڕەنگ کراوە و هیچیشی لە شیوعی نەداوە. بەڵام دڵسۆزی ڕوونی کە بارودۆخی دەوروبەری بە بۆیەی سوور ڕەنگی دەکا و ئێمەش لە قسەی ڕووندا ئەوپەڕی پێویستیمان بە ویژدان هەیە و بەرژەوەندی هاوبەش ڕەتی دەکاتەوە بیانوو بە یەکتر بگرین و مادام هۆکاری قەبووڵکراو هەبێ، هەق نییە بیانوو ڕەتبکرێتەوە.

کاتێ دەڵێم لە هەموو قسەکانی هەتا ئێرەم هەوڵم داوە ئەوەندەی دەسەڵاتم بووبێ و لە تواناداا بووبێ، پەیڕەوی ڕوونی و ویژدان بکەم، ڕەنگە خوێنەر لە باوەڕکردن بە قسەکانم قرچۆک نەبێ و لە قسەکردن یا وەڵامدانەوەم بۆ دواقسەکانی دکتۆر عەبدولڕەزاق محێدین پێویستیم بە ڕوونی زیاتر و دڵگەورەیی خوێنەری عارەب هەیە و دەستبەرداری ویژدانیش نابم ئەگەر حوکمەکەی بشمبرێ. بۆ کوردێکیش ئاسان نییە بە تەنگوچەڵمەی سیاسەتەوە گرێ درابێ بەرەو ئەو لووتکەیە ململانێی دکتۆر بکا کە کۆتاییەکەی کردۆتە تاجی سەری گوتارەکەی و زۆر سەیرە دامێنی گوتار جێی لووتکەی هەرەم بگرێتەوە.

دەی سا خوایە بە دەرگای ڕاستگۆییدا بمبەرە ژوورەوە و بە دەرگای ڕاستگۆییدا دەرم بێنە چونکە ئەم پیاوە ڕێیەکی وەهای بۆ ئاشکراکردن گرتۆتە بەر بە زمانی ڕاستگۆدا نەبێ نایێ و ڕێیەکی گرتۆتە بەر هەنگاوی دڵنیایی نەبێ نایێ... لە سەر شێواز و ڕێیەکە بەردەوام بوو تا گەیاندیانیە شوێنێک لە ئاواتی قەومەکەم باڵاترە و مەبەستیشیان لە دوایەوە دێ. کارێ بکە دەستم دەستی ئەو بگرێ و قەڵەمم بە مەرەکەبی زەریای خۆت پڕ بێ و لە نووری خۆت ڕووناکی بەوانە ببەخشە کە تەماشا دەکەن تا باش ببینن و غەدر نەکەن و گەردی دوژمنایەتی لە سەر ئەو دڵانە هەڵگرە کە بوختانی تێکدانی برایەتی بۆ هەوڵی پتەوکردنی دەکەن گوایە بانگی لێکترازان و دابڕانە و هاواری کاولکارییە. ئێمە بۆیە ئەم ڕێگایەمان گرتە بەر درکمان بە هەبوونی ڕووناکایی کرد لە لێوارەوە و لە سەرچاوەی مەحکەمەوە بەری دەکەوت و ڕێنیشاندەری ڕاستی بوو «باوەڕداران بران» و دڵمان نەهات هاوسەنگی نزیکایەتی و بەزەیی تێکبدەین تا وڵاتیان لێ بشێوێ و کاروباریان ڕوو لە کەمیی بکا. زۆر میللەت ناتەبایی ڕووی تێکردن و زەلیل بوون و گرێیان وەک ملوانکە ترازا و سستەمیان شێوا و گردبوونەوەیان نەما و توانایان نەما ئەوجا شکستیان هێنا و ناوبانگیان بڕا و لە ناو خەڵکدا باویان نەما و ناتەبایی وێرانی کردن تا بە بێ پلەوپایە و ڕێز و دەسەڵات لە خۆیاندا گۆشەگیر بوون و بوون بە بار بە سەر هەردوو دنیاوە.. فەرمانت بە برایەتی دا و ڕێبازیت ڕوون کردەوە و ماف و سنوورەکانیت دیاری کرد و حیکمەتت تا ئەو ئەندازەیە بوو ڕێی ناتەباییت بڕییەوە و دڵانت بۆ ڕێککەوتن ئاشت کردەوە و حوکمت لە سەر کەمترین کەلەپوور دا و ئەگەر دوو برا وەریبگرن نێوانیان تێکناچێ و ئەم عیراقەش کە عارەب و کورد خاوەنین وڵاتێکی فرەوانە و ئاوی زۆرە و خۆشەویستی سەر دەکا و میوەی بەردەوامە و تەختانی لەوەڕگەیە و جێی عاسی قەڵایە و بۆ سەروەری و خۆڕاگری و بەختەوەری، هەموو بابەت و کانزا و مەرجێکی تێدایە و بە یەکگرتنی برایانەی ڕۆڵەکانی و یەکڕیزی و یەکدەنگی و یەکهەستی و تێگەیشتن لە بەرژەوەندی هاوبەش لە

بەرنامەیەکی ڕووندا وەک ڕوونیی مافەکان مەرجی قایمکاری تەواو دەبێ و پێش بە گومان و وەهمی دەروون دەگیرێ و ڕێی فیتنەکار دەبڕێ تا کەس چپەی گومان بە دڵی کەس نەگەیەنێ و بە دابڕان لە کەسانی نزم و شێواو دەکرێ ڕێبازی برایەتی دامەزرێ و ستوونی شەریکایەتی لە سەر خاکێکی پتەو دامەزرێ و گۆشەکانی بە لادا نەیەن و بینای نەلەرزێن.

ناسکی بارودۆخی برابچووک و شەریکە لاوازەکە لە ئاستێکدایە بە زیادکردنی کەمترین قورسایی دانەوێڵە تای تەرازووەکەی دادەبەزێ، چونکە ئەمڕۆ لە ناو هەرای مێژووەوە، بە پرچی شێواو و جەستەی تۆزاوییەوە، بە برینی دوو هەزار ساڵ یا زیاترەوە خوێنی لێ دادەچۆڕێ و زنجیری پشتاوپشتی لە ئێسکی چەقیوە و ئەگەر ببینی لە دەستی هەڵدێیت و لە ترساندا دوور دەکەویتەوە!!

ئەم ڕۆژگار دوای زامدارکردن و چەوساندنەوەی بە وێرانی دەیدایە دەستی ئەو ڕۆژگارەوە و هەموو خاڵە لاوازەکانی بۆ هەر کەسێکی لێی بدا یا چەقۆی پێدا بکا ئاشکرا بوو هەتا گەیشتە ئەوەی چمکێکی قەڵغانی تەمووز بە جەستەی هەلاهەلایدا بدا و چاویش بە دوای براکەیدا بگێڕێ: ئەی برام بە قەدەر مافی خۆم لەو قەڵغانەم پێ بدە یا بە ئەمانەت بمدەرێ تا خۆم لە تیر بپارێزم چونکە تیرەکان دەمهێشێنن.

بارودۆخ و سۆزی وای لێ دەکەن نازانێ کاسەکەی پڕ لە خوێن بووە و لێی دەڕژێ یا کەرامەتی لێرە و لەوێ پێشێل دەکرێ و لە سەر هەموو ماڵە کوردێک دڵڕەقێک چۆکی داداوە: ئەی برام لە زاد و فیشەکی خۆمان یا لە زاد و فیشەکی خۆت، ئەوەندەی برایەتی ڕێ دەدا بمدەیێ، ئاخر ئەوانە خەڵکانێکن لە چەوساندنەوەمدا نقوم بوونە و دەکوژن و دەبڕن و دەسووتێنن و ئابڕوو دەبەن! تەماشا کە بزانە چی بۆ وەلانانی بەڵا و بڕاندنەوەی گلەیی بە چاک دەزانی. ئاخر من تێکشکاوم، هاوکاریم بکە...

هاواری فریاکەوتن بۆ براکەی لەو غەدرانەی لێی کراون چەند دەکەوێ و ئەگەر لە هاواری لێقەوماو غەدر یا هەڵە هەبێ، عەمری ئەو پیوەرە نەمێنێ

کە ئەخلاق و بەهای پێ دەپێورێ و با ئەو ژیانەش کە لە سەر پاڕانەوە و تەکلیف و خۆسووککردن و قەرزوقۆڵە وەستاوە هەر نەبێ.

ئەگەر یەکێ بپرسێ ئەو هاوکارییە بۆ عارەب سوودی چیە، لە وەڵامدا دەڵێم کوا هەقی ئەو قوربانیانەی کە کورد لە پێناوی عارەب و ئیسلامدا دای و ئەو خوێنەیان کە لە سەر خاکی قیبلەی یەکەم و دووەم حەرەمدا، لە سەردەمی خاچهەڵگران و زایۆندا ڕژا چی لێ هات و مەگەر بیری عارەب تووشی لەبیرچوون بووبێ یا بڵێین ئەی بە داخەوە بۆ دەسخەڕۆیی هەوڵ و بێئەنجامی هیوامان.

کوردیش لە ڕۆژی ئەمڕۆدا، سۆزیان بە قەدەر سۆزی عارەب هەتا ئەو جێیەی پیتی (ض) بڕ دەکا و میحراب هەبێ قووڵ دەبێتەوە و سەرنجی بۆچوونی عارەب دەدا و بە نێوان ئۆقیانووس و کەنداودا چاو دەگێڕێ تا باسکی لەگەڵ باسکی عارەبدا بەرەو ئەو شوێنە بەرز بێتەوە کە لێی ورد دەبنەوە، ئایە لە بەرژەوەندی عارەبدا نییە ئەو باسکە کوردییە بەهێز بێ بۆ ئەوەی لێدانەکانیان یەک لێدان بێ و دەستدرێژی بهاڕێ؟

لەم هاوبەشییەی کورد و عارەبەدا کە جیابوونەوە قەبووڵ ناکا، ئایە لە بەرژەوەندی هۆکاری پەیدابوونی ئەو هاوبەشییەدا نییە هاوبەشی نێوان بەهێزانی بەویژدانی خاوەن سەرمایەی بەرین و زەخیرەی ئاشتی و بەرگری بێ.

ئەگەر پێتان وایە ئێمە لە قسەکانماندا هەڵەین یا شتێکتان تێدا بەدی کرد لە بەرژەوەندی عارەبدا نەبێ یا ئەرکی چاکەدانەوە و برایەتی نەبێ بیڵێن تا لە گۆشەنیگایەکی تازەوە لێی بڕوانین کە ڕەنگە دیمەنەکە زۆر جیاواز بێ، ڕێزی هەستی کوردیش بگرن کە بەرانبەرتان زۆر لەوەی چاوەڕوان دەکەن ڕوونترە و سۆزیش ئەگەر نەچێتەوە سەر ناخ و ویژدان بە دەگمەن ڕوون دەبێ. ئەی برا عارەبەکان لەوەدا هاوکاریمان دەکەن ئەو نەسیحەتە باڵایانە لە گوێ بگرین کە دکتۆر لە بارەی جیاکردنەوەی قەومییەت لە مەسەلە فەرموویەتی

و ناوەندی نیشانی پێکاوە و لەوەشدا لایەنگرین کە هیچ گەلێک لەو ڕێیەوە نەبێ بە مافی خۆی ناگا..

ئێستاش لە مەزەبی قسانداا وەرنە سەر قسەی ڕاست و ڕێگای ڕاست و دروست..

ئێمەی کورد لە چارەسەری «کێشە»کەماندا زۆر پێویستمان بە پتەوکردن و بەهێزکردنی «نەتەوایەتیمان» هەیە تا ئەوەندە بەهێز بێ قابیلی بێدەنگکردن و پەراوێزخستن و دانەبڕان نەبێ. نەتەوایەتی بەهێز وەک تۆویکە ڕەگ و دەمار بە دەوریدا گرد دەبنەوە و ڕیشوو و تویکڵ هاوکار دەبن بۆ ئەوەی ببێتە بەرێک و سوودی لێ ببیندرێ و کورد کوا ئەو تۆوەی هەیە و چۆن بیخەینە سەر ڕێگای بەهێزبوون؟

بەڵام ئەوەی کە کورد هەستێکی نەتەوەیی وای هەیە بۆ بنیاتنانی کەسایەتی دیاریکراوی خۆی پشتی دەگرێ، ئەوە ڕاستییەکە و کاروانی شەهیدان لە هەر خاکێکدا لێی بووبن شایەدە و هەندێکیان هەتا ئێستاش لە بیرەوەری سەردەمی منداڵی گەنجەکانماندا ماون و لەو چاوانەدا دیارن کە بۆ نیشتمانپەروەری دەچروشکێنەوە و هەر دەڵێی ڕێڕەوی کارەبا یا لێشاوی گڕاون.

لەگەڵ هەر باسکردنێکی کوردستاندا و لەگەڵ هەر خەیاڵێکی نیشتماندا. لە گەرمایی جگەریان و هەڵاوی هەناسەیان و گڕژبوونی دەماریانەوە درکی پێ دەکەیت. لە نزیکەی پێنج سەد بارزانیدا هەستی پێ دەکەیت کە دە ساڵ و دووی تریشیان لە بێشکەی کۆمۆنیزمدا بە سەر برد و کە گەڕانەوە نیشتمان وەک یەکەم ڕۆژی دەرچوونیان زمانیان پاراو و ویژدانیان ئارام و لە نەتەوایەتیدا تۆخ و بە دەشت و شاخ و ڕووباری ڕۆژ و تاریکەشەودا، بازنەی سێ دەوڵەت بە دەوریەوە مەزنێک لە شەڕی دەستدرێژکەردا پێشیان کەوت و مەودای وایان بڕی چاو بڕی ناکا و ئەگەر بە بێ شەڕ و بە ئاسایی پێیدا بڕۆی پێیەکانت شەکەت دەبن.

ئەو ڕاستییە بە بەرجەستەیە لە گەرموگوڕی گەنجە خوێندەوارە ڕۆشنبیرەکاندا وا دەبینی، پێت وایە ئەوانە پەیامبەری نیشتمانپەروەری کوردن، جا چ لێرە و چ لە نیشتمانەکانی تری کورددا و چ لە پەیمانگاکانی ئەوروپا و ئەوانەش کە لە پێناوی گەیاندنی پەیامی نەتەوەیەتیدا قوربانی بە خوێندن و پاشەڕۆژیان دەدەن و کەلاوەیەک بۆ کەسوکاریان جێدەهێڵن و ئەو پەیامەیان لە پەیامی خوێندن و ڕۆشنبیری و مەعاش پێ بەرزترە چەند زۆرن. هەواڵی کۆنگرەی سالآنەیان لە ئەوروپا بە ئێمە دەگەن و جگە لە هەستی سەرکردووی ناخیان کە نایەوێ لەو بارودۆخە ناخۆشەشدا کرٍ بێ، کەسیش لایەنگر و پشتیان نییە. لە دیاردەیەکی دەگمەنی دیاردە ڕەسەنە نیشتمانپەروەرییەکاندا دەبینی کە لە کورددا هەیە و لە گەلێکی تردا دەگمەنە ئەوەش ئەوەیە زۆرینەی شێخ و ملّکدار و عەشرەت و هەرچییەکی لە بواری سیاسەتی ئەمڕۆدا پێی دەڵێن «ڕەجعی»ی کورد، لە ئامادەیی و قوربانیداندا بۆ بەرژەوەندی کورد و مەسەلەکەی وەها دەکولێن، بە هۆی ڕوونی مەبەست و حەماسیانەوە، وا دەزانی ئەوان لە مەیدانی تێکۆشاندا پێشەنگی خەبات و مشتی بەهێزن. خۆڕاگرەکانیان، لە یادەوەرییەکدا و تەنها لە پێناوی کورددا و دوور لە هاتوهاواری پێشکەوتنخوازی و دیموکراتی، بەرانبەر ئەو هەموو سووکایەتییە تاڵەی هەندێ لە خۆبەچەپزانەکان خۆیان ڕاگرت و بروسکەی «دەرەبەگ» ێک و یەکێکی تری بە دوودا هات کە یاسای چاکردنی زەوی گرتبوویەوە و هەستی نەتەوایەتی تیایاندا بەرژەوەندییان وەلانابوو و ئەو دوو بروسکەیە ڕووی زاریان لە ویژدانی کورد بوو نەک دەسەڵات و حکوومەت، لە دژی بەرژەوەندی خۆیان داوای جێبەجێکردنی یاساکەیان و دابەشکردنی زەوییەکانیان دەکرد بە سەر جووتکارانی کوردستاندا... ئەرێ بەو خودایە، کوردستان بە حەرفەکانیەوە و بە زرینگەی ناوەکەیەوە و بە پرشنگداری واتایەوە، ئیتر با تیۆرییەکان بەڵگە خەیاڵییەکانیانی خۆیان بۆ ئەوە بهێننەوە کە ویژدان لە بەردەم تەوژمی بەرژەوەندیدا بەچۆکدا دێ.

نەتەوایەتی کورد لە هەموو شتێکدا بەدی دەکەی کە تروسکایی نیشتمانپەروەری تێدابێ، ئەوانە نەبێ کە لە بن چەند چینێکی خۆڵەمێشی نانەتەوەییدا حەشار دراون، ئەوەش ئەگەر لەگەڵ سەرجەمی گەلدا پێوانەی بکەی بەشێکی کەمە لە زۆر.

نیشتمانپەروەری کورد لە مێژووی نوێیدا دیاردەیەکی زەقە و لە خەسڵەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوینی دوای یەکەم جەنگی جیهانییە و ڕەنگە پێویستی بە خاوێنکردنەوە خۆڕاهێنان هەبێ ئەوجا ڕێکخستن و ڕیزکردن، بەڵام حەقیقەتێکی هاندەرە و وەک دەستپێکردنی «مەسەلە»ی کورد سەرەتایەکی نایابە بەرەو هەناسەدان و ژیان لە ئاستی دەوڵەتاندا. ئەگەر قەدەری عارەب وابێ بۆ بەدەستهێنانی ماف پشتی کورد بگرن بە مەرجی هەبوونی نەتەوەیی کورد کە شانازی بە خۆیەوە بکا و بژێوی لە سەر تایبەتمەندی و خەسڵەتی خۆی بێ و لە هیواکانی خۆیەوە سەری هەڵدابێ، فەرموون ئەوە میتاڵی خاوێن و جەوهەری ڕەسەن و کۆی بکەنەوە.

لە پاشەڕۆژێکی نێزیکدا عیراقی شۆڕش ڕازی دەبێ وەها یاسا دانێ و دەستوور ڕێکبخا، بەهێز و بەردەوام بێ. گەلانیش بە دەستوورەوە وابەستەن تا مافیانی پێ پەرژین بکەن تا لە غەدر و دەستدرێژی پارێزراو بێ و ئەگەر هەموو تاکەکانیشیان لە یەک نەتەوە بن و خاوەنی یەک زمان بن و یەک مێژوویان هەبێ و یەک دڵ خوێن بە ڕەگیاندا بێنێ و ببا، هەر وا دەکەن. پشتبەستن بە دەستوور و پەنابردن بۆی، لە پلانڕێژی وردەوە دێ و سەرچاوەکەی غەریزە و فیترەتە کە وا لە مرۆ دەکەن ئارامی و ئاشتی و پاراستنی کەرامەت و ئازادی کار و دەربڕینی بە فرەوانترین واتایانەوە پێ خۆش بێ. هۆکاری هەوڵی چاککردنی دەستوور بۆ کورد ڕوونتر و ئاشکراترە چونکە دەیەوێ شتێک لە پەنایدا بپارێزێ کە لە ئاشتی و کەرامەت باڵاترە و ئەوەش بەوپەڕی ڕوونی، بوونیەتی کە بە بێ ئەمەیان ئاشتی و کەرامەت و ئازادی کارکردن و ڕادەربڕین دەبنە تەراویلکەی بیابان یا نووسینی ڕووبەری ئاو یا نیگارکێشان لە هەوادا. شۆڕشی تەمموزیش لە بەرەبەیانی

بەرپابوونیەوە درکی بەم ڕاستییە کرد و لە ماددەی سێیەمی دەستووری کاتیدا خەیاڵی کوردی بە دروستکردنی شوورایەکی بەهێز بە دەوری خۆیان و مافیاندا ئاسوودە کرد و دڵەڕاوکێی ڕەواندەوە. ئەگەر بێینە سەر باسی باشترین ڕێگا بۆ گردکردنەوەی هەموو جۆر و کەرتەکانی کورد تا بەو ڕێیە مێژووییەی خۆیدا بڕوا کە لە مێژووی گەلاندا بۆ خۆدروستکردن و پێکهێنانی ژیانی خۆی باس کراوە، یەکەم هەنگاومان ئەوە دەبێ ئەو ماددەیە بگوازینەوە سەر زەوییەکی پتەو و بەپێتی دەستووری هەمیشەیی.

ڕەنگە بڵێن دەستوور لە لایەن پەرلەمانێکی هەڵبژێردراوەوە دانەڕێژرێ و بڕیاری لە سەر نەدرێ نابێ و هەتا ئێستاش پەرلەمان هەڵنەبژێردراوە تا قسە لە سەر دوای هەڵبژاردنی بکەین. بەڵام عادەت لە هەڵبژاردندا وایە ئەوەی گەل دەنگی لە سەر دەدا، نووسراوە و ڕوون کراوەتەوە و ڕێکخراوە. هیچ یاسایەک نییە بدرێ بە لایەنی یاسادانان ئەگەر دانەڕێژرابێ و بەشبەش نەکرابێ و هۆکاری دەرکردنی لەگەڵدا نەبێ. ئەگەر وا دانێن دەنگدان بێ ئامانج و بێ ڕێڕەوی دەستنیشانکراوی پێشوەخت دەکرێ، ئەو ئەرکەمان لە سەر شان لانابا کەشوهەوا و بیری خەڵکی بۆ ئامادە بکەین تا ماددەی سێیەمی قەبووڵ بێ و لە سەرەوەی گومان و دوودڵییەوە بێ. ئەگەر لەم ئەلفوبێیەدا هیممەتمان نەبێ مەودای قسەکردنمان بۆ دوای ئەوە نابێ کە چ هەوڵێکی زۆری دەوێ تا کورد بگەیەندرێتە ئامانجە مەزنەکەی خۆی. ڕەنگە ئەو سووربوونەی کە مرۆ دەگەیەنێتە گومان وای لێ کردبم ئەم قسانە بکەم دەنا دوای ئەوەی دەستی قەدەر خەتی ڕووناکی بەرەبەیانی شۆڕشی چواردەی تەمموزی کێشا، ئەو دەستە پیرۆزەی خەتەکانی دانانی بە ماف و بوونی کورددا کێشا ئەمڕۆ ڕازی نابێ بە دەستەچەپی بیسڕێتەوە یا بیکوژێنێتەوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گومانی ڕووشاندنی هەستم هەیە چونکە هەتا ئەمڕۆ لایەنی عارەبی هەن لە ئاستی مافی کورد و ماددە سێیەمەکەیاندا بە جۆرێ بێدەنگن وا ناگەیەنێ ئەو مافانەیان بە دڵ بێ. خەڵکی وا هەن بە ئاماژە و بێ

ئەوەی قسەیان ڕوون بێ هەرا بەرپا دەکەن و ئەوەش پێشەکییە بۆ شتێک نامانەوێ پێشبینی بۆ بکەین و ئاشکرابوونی بۆ ڕۆژانی داهاتوو لێدەگەڕێین.

حیزب هەن باسی مافی کورد و ماددەی سێیەمی کورد، لە بەرنامە پڕەکەیاندا نییە و کاتێ یەکێکیان بە قسە ئەوەی دەرخست دەرگای هۆشم بۆی لەرزی و زۆری نەمابوو بکرێتەوە. شتی تری بچووک و نابچووک هەن کە خەیاڵ دەبزوێنن و دەبنە هۆی گومان.

ئەگەر ئەم لاپەڕەیەی بەربەستت هەڵدەینەوە و بۆ ئەو ئاستە باڵایەی جارانمان کە قسەمان لە بارەی بەهێزکردنی لایەنی نەتەوایەتی کوردەوە دەکرد بەرز بینەوە و وامان دانا کە ماددەی سێیەم ڕاستییەکی جێگیرە و لە دەستووری هەمیشەییدا هەیە، دەمێنێتەوە ئەوەی دوای لەدایکبوونی ئەو ماددەیە کاری بکەین هەناسە بدا و خۆراک بخوا و بژێ و گەشە بکا و گەڵا دەر بکا و بەر بگرێ.

کەس دەمەتەقێ ئەوەم لەگەڵدا نەکات کە تەنها بە ماددەیەک یا سەد ماددەی دەستوور خۆبەخۆ هەستێ دەرگای داخراو لە ڕووی نەتەوایەتی کورد بکاتەوە و بەکاوەخۆ پێیدا بەرەو مەسەلەی خۆی تێپەڕێ.

قەومی عارەبی کە بەڵێنی هاوکاری بە کورد دەدا کێشەکەیان سووک بکا، پێویستە هەر ئێستا لە سنووری ئیمکانی بەر دەستیدا ئەوە بکا، خۆ لە سنووری عیراقدا هەرچی گەرەک بێ پێی دەکرێ. بیانووی نەبوونی لە مەودا و ڕەهەندی نەتەوە و کۆمەڵگاکاندا، ئەگەر عەزم بۆ دەستوەشاندنی بروسکە ئاسا جەزم بێ بەجێ نییە. خۆ هەر لەو نەتەوە و کۆمەڵگانە بژێوی نەتەوایەتی و ژیان و گەشەکردن بە کورد دەگا و ئەوەش زادی بەپیتی بێ کۆتاییە و قەدەغە نییە و ئەویەڕی ساکار و ڕوونە و لە خەیاڵی خەیاڵبازان و داهێنانی قسەزانەوە نەهاتووە و نەتەوایەتی کوردیش لە سەر دوو پایە بەهێز دەبێ و ڕاست دەبێتەوە و لە سەر ئەو دووەش نەبێ بینای بەهێز هەڵناسێ: ڕۆشنبیری و ئابووری.

مافی ئەو دووەش بە قووڵی و بە بەرینی نادەین چونکە لە بارێکدا نین تۆژینەوە و لێکۆڵینەوە بکەین و قسە بەوە کورت دەکەینەوە کە ڕۆشنبیری کوردی هی ئەوەیە وەک ڕۆشنبیری عارەبی گرنگی پێ بدرێ و کەرەسەی لەبار و پێویستی بۆ فەراهم بکرێ ئەوەش کەرەسەیەکی دامەزراوە بە ناوی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری کوردییەوە و زاراوەی لەوە باشتر بەڕێوەبەرایەتی مەعارفی کوردستانە و منداڵانمان لە سەر لووتکەکان و نێوان تەنگەبەرەکاندا گرِوگاڵی پێ دەکەن و تیایدا سەری زمان دەگرن. بەڕێوەبەرایەتییەکی شەل، وەک دەیبینین قورسایی جەستەی لە سەرە و بە شەلەشەل بەکێشی دەکا، بە هەنگاوی تەمبەڵەکانرا ناگا و باسی ئەوەش نییە وەک دەمانەوێ و دەبوو وابێ، بە هەنگاوی خۆشرەوتەکانرا بگا. لە سەریەتی فێڵ لە زەمانە بکا تا قەرزی دەیان ساڵەی بێبەشکردنی کورد بداتەوە لە ڕۆشبیری و فێربوون و قەرزی دووسەرەی کەوتۆتە سەر و ئەگەر توانا و پارە و پشتگیری و هاندانی نەبێ و بەربەستی پێشی لانەبرێ و مەودای پێویستی بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری نەتەوەیی بە زمانی کوردی پەتی لە گوندەکان و شارەکاندا نەبێ تا دوا قۆناغەکانی خوێندن و دوای ئەوەش خوێندنی باڵا لە هەموو بوارێکدا کە زانست و تاقیکاری و تەکنیکی لێیە، ئەو کارەی پێ ئەنجام نادرێ. شیعر و پەخشان و داهێنانی وامان دەوێ هیممەت بەرز بکەنەوە و بە توندی و ڕوونی ویژدان بهەژێنن. خوێندکاری زیاتری کوردمان لە قوتابخانەی جەنگ و پەیمانگای هێرش و بەرگریدا دەوێ تا هەوێنی ڕاهێنانی گەنجەکانمان پێبگا و پارێزگاری لە سنوور و مەیدان بکەن تا هەر کاتێ بۆ گەڕاندنەوەی کەرامەت و مافی زەوتکراو بانگ بکرێن ئامادەی شەڕ بن.

ئەلفوبێ و بیرکاری و جوگرافیا یا هەر بابەتێک باسی زانستی ڕەها دەکا و قوتابی تێدا تاقی دەکرێنەوە تا ئاستی سەرکەوتن ببرِن یا بمێننەوە بەس نین، ئەوانەمان دەوێن و لە سەر ئەوانەشەوە دەمانەوێ لەگەڵ هەر پیتێک و هەر ژمارەیەکیشدا هەستی نەتەوایەتی برِژێتە ناو خوێنیانەوە.

چاوانمان دەوێن توندڕەوانە زەق ببنەوە و قورگمان دەوێن بە نەعرەتەی نەتەوەیی شەق بەرن و سینگمان دەوێن ئاگر و هەڵاویان لێ هەستێ و دڵمان دەوێن لە نێوان پەراسووەکاندا وەها هەڵبەزنەوە وەک ئەوەی بیانبرژێنن و ئەگەر پێشمان بڵێن ئەوە شێتی و نەزانییە، لە بەهەشت پێم خۆشترە چونکە دەروونمان لە شەرمەزاری زەلیلبوون پاک دەکاتەوە و فێرمان دەکا چۆن خۆمان بە سەر دنیادا بسەپێنین و تف لەو ڕێزی عاقڵبوونەی سەر زەلکاوی سووکایەتی و حەقارەت و لەناوچوون دەکەوێ.

لە بواری ئابووریشدا شتی وامان دەوێ چونکە پێویستمان بەوەیە باسک و لاقمان بەهێز بن نەک چەوری زیادە لە جەستەماندا کۆکەینەوە و بۆ زەوییەکانیشمان پیت و بەرەکەت کە لە وێنەی دەگمەنە و هەرچی لە سەر زەوی بڕوێ لێی دەڕوێ، لە دانەوێڵەوە بگرە تا تەڕە و سەوزە و میوەجات و هەرچی مرۆ حەزی لێیە و بۆنەکەی پێ خۆشە. لە ناخیدا زێڕی سپی لە کانیەکانەوە دەتەقێتەوە و زێڕی ڕەش بە خێری گڕدار دنیا ڕووناک دەکاتەوە و هەروەها میتاڵی پاکیزەی تر کە دەستی مرۆڤیان پێ نەگەیشتووە، لە ناو خۆڵ و بەرددا دەدرەوشێنەوە و چاوبرکێ لەگەڵ چاواندا دەکەن و زەوی سەوز و دارستانی پێچاوپێچ و کێڵگەی پڕ لە دەنگی پەلەوەر و هەموو کەوڵدارێک و مووداریک و کولکدارێکی تێدان و مەڕ و مانگا تیایدا وەڵامی یەک دەدەنەوە و هەروەها هەرچی بحیلێنێ و ببۆڕێنێ و هەنگیش لە خۆشی ئاوبارەی گوڵ دەگیزێنێ و خۆزگە هەنگوینخۆریش پێی ڕازی بوایە.

نیشتمانەکەم بەهەشتێکی پارێزراوی بۆنخۆشی ئامێزی لووتکەکانە و بە بێ دوو بەهەشت نابێ: باغێکی بۆنخۆش بە گوڵ و بە دار، دانەوێڵە و میوە دەبەخشێ و باغێک کە بەرد و گەوهەری بەهادار لە خۆڵەکەیدا دەچروسکێنەوە و ئاوی ڕوون بە پێچەکانیدا دەڕوا و لە ناخیدا زەیتێکی زۆر دێت و دەچێ.

هەموو ئەوانە ڕزقی بەپیتن و بۆ بەرزڕاگرتنی پەیام هاوکاری باسک و هۆش و دڵ دەکەن ئەگەر لەگەڵ شیری دایکدا ببنە بژێویان و بۆ جەنگاوەر و هەرچییەکی لێیەوە دەهاوێژرێ دەبنە پەنا هەر وەها بۆ ئەوەی پلە بە پلە یا بە پەلە تۆمار دەکرێ.

ئەگەر ڕۆشنبیری و ئابووری بە پێی مەرجەکانی شەریکایەتی و برایەتی پەیکەری دەستکردیی شۆڕشی نەمریان لەخۆ گرت، هێزێکی دەستوەشێنی لێ دەکەوێتەوە و بە درێژایی ڕۆژگار دوژمن لە هەردوو برا دوور دەخاتەوە و سەرمایە و وڵات دەپارێزێ و لەوەش پەکی ناکەوێ لەگەڵ ڕۆژگاردا مەسەلەی کورد لە هەموو بوارەکاندا بەرەو پێش بەرێ و لە هەر جێیەک زایۆنی یا ئیستیعمار شەڕ بسەپێنێ، شانبەشانی عروبە شەڕ بکا و هیوای کورد لە عیراقدا بۆ ئەوەی بەرەو ئاواتەکانی خۆی و بەهێزکردنی برایەتی خۆی لەگەڵ عارەبدا هەنگاو بنێ بۆ سەرکردایەتی پڕشکۆی شۆڕش بەرز دەکاتەوە کە مێژوو پلەوپایەی پێ داوە یا لە مێژووەوە پلەوپایەی بەرزی بە دەستهێناوە و دەتوانێ بەو ڕێڕەوەدا بڕوا کە دیاری کردووە تا تاجی ڕزگاری لە سەر دەنێ و سەردەمەکانی تر شانازی پێوە دەکەن و هیچ میللەتێکیش لە کورد زیاتر پێویستی بە سەرفرازی نییە چونکە لە دنیادا لەو زوڵملێکراوتر نییە...

دەستپێکی تەمموز دەستپێکێکی شەریفانە بوو کە هات و بناغەی مافی کوردی لەگەڵ بناغە گرنگەکاندا دانا و لە ناخەوە ئاواتەخوازین کۆتایی ئەو دەستپێکە ئەوە بێ کە ئێمە لە بەیتێکی شاعیرێکی کورددا دەیهێنینە و دایدەڕێژین، کە لە شیعری عارەبیدا پلە و پایەی بە دەستهێنا و بۆ عارەب ژیا و وەک زۆر لە عارەبە ڕەسەنەکان بە ناخۆشی مرد:

ئەی خوایە بەو سەرەتای موسوڵمانانت چاک هێنا و
چاکەکەت تەواو بکە و کۆتاییشیان با چاکەکار بێ[3]

**باسێک خۆی دەسەپێنێ**

ئەم باسە وا دەبینم شەڕێکە و یەخەی گرتووم، چونکە نووسەرانی «خەبات»ی بەڕێز هەر بە مەبەست زیادەڕۆییان لە تۆمەتبارکردنی ئەم دەردەدڵەدا کردووە کە بۆ پتەوکردنی برایەتی عارەب و کوردە و لە لاپەڕەکانی «العربیة»دا بڵاو کراوەتەوە و بۆ فێڵی ئیستیعماریان گێڕاوەتەوە و لەعنەتی خوا لە ئیستیعمار هەر لە ئێستاوە تا ڕۆژی زندووبوونەوە. هەموو مەسەلەکەش لە یەک ڕستەدا کۆبۆتەوە کە نە ئاڵۆزە و نە ناڕوون، ئەوەش ئەوەیە ئەگەر حیزبێک ڕێی هەبێ ڕایبگەیەنێ یا بنووسێ بە فەلەکی ڕۆژهەڵاتدا یا ڕۆژاوادا دەخولێتەوە ڕێی نییە ئەو واتایە بە هەموو دنیا بدا کە گەلی کورد لەگەڵ هەمان حیزبدا بە هەمان فەلەکدا دەخولێتەوە، چونکە ئەوە بەرپرسیارەتییەکی گەورەیە و لە منداڵی قوتابخانەی سەرەتایی شاراوە نییە و ڕێ بە هەموو کوردێ دەدا لە هەر چین و توێژێکدا بێ، ئەوە بڵێ و بنووسێ کە بەرپەرچی ئەو بۆچوونە بداتەوە و گەلی کورد بە فەلەکی بەرژەوەندی خۆیدا دەسووڕێتەوە و هەرگیز لە بەرژەوەندیدا نییە لە سەر یەکێ لە دوو کامپەکە ساغ بێتەوە چونکە لایەنگرییەکی خۆبەخشانەی بێ بەرانبەرە و هیچ حیکمەت و لۆژیکێک قەبووڵی نییە بەخشین بە بێ بەرانبەر بێ.

ئەگەر نێزیکترین قەوم لە کوردەوە کە عارەبە، لە پشتگیری کورددا بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی و پارێزگاریکردن لە کەرامەتی بەخیل بێ، لە

[3] مەبەستی مامۆستا، «ئەحمەد شەوقی»یە کە بە ڕەگەز کوردە و لە کۆتایی شیعرێکیدا دەڵێ:

یا رب أحسـنت بَدْءَ المسـلمین بە　　فتمِمِ الفضل وامنح حُسـن مختتـم – وەرگێڕ

کوردەکان حەرامە بۆ پشتگیری عارەب یەک حەرف بڵێن، ئەوە بۆچوونی منە و ئیتر هەرکەسە و چی دەڵێ با بیڵێ.

ئەوەی حیزبی بەعسیش دەیکا کاری من نییە و پەیوەندیم بە کەسی حیزبی یا ناحیزبییانەوە نییە و یەک زەلامی بەعس ناناسم، یا ڕاستترە بڵێم زانیاریم لە سەر یەک تاکە زەلام نییە سەر بە بەعس بێ و ڕەنگە سەرانی پارتی کوردستانی لە بری ئەوان وەڵام بدەنەوە چونکە لە سەردەمێکی شۆڕشدا پەیماننامەیەکیان لەگەڵدا مۆر کردوون تیایدا هاتووە کە عیراق بەشێکی دانەبڕاوە لە ئوممەی عارەبی.

خوا دوای کینەی ناحەزایەتی ببڕێتەوە چونکە دڵی ناو سینگ کوێر دەکا. ئەگەر شتێ بخەمە سەر ئەو باسەی لە سەر کورد کردم، ئەرک پێمی دەکا و نازاندرێ چۆن گوتەی نووسەرێکی عارەب لێکدەدرێتەوە کە لە باسی مەسەلەی کورددا دەڵێ «یەکبوون و سەرخۆبوون» ڕەنگە وا لێکبدرێتەوە کە ئەوە ڕێکەوتننامەیەکە بۆ بەعارەبکردنی کورد. ئەرێ ئێوە چۆنچۆنی حوکم دەدەن!

ئەوەی قسەی ناشرینیشم پێ دەڵێ، لە دوو قەید ڕەهایە، یەکێکیان ئەوەیە خۆم لە توندوتیژی بە بەرزتر دەزانم. ئەوی تریشیان سڵکردنەوە لە بەرەوڕووبوونەوە بە هەمان شێواز...

ئەوەیە جیاوازی من و ئەوانەی جنێوان دەدەن.

نووسینی مامۆستا هۆشیار (مەسعوود محەمەد)

**بە کورتی**

دەزانم «دەمودووی هزر لە بەرەژانی مەرگی سەججادیدا»، وەرگێڕانێکە، وەک ئەوەیە مژدەی مەرگی تێدابێ، چونکە بەرەژان مژدەی لەدایکبوونە نەک مەرگ. بەڵام ئەوەم وا داڕشتووە چونکە بە خوێندنەوەی بابەتەکە و لێحاڵیبوونی، بەو ئەنجامە گەیشتم کە کەسێکی وەک سەججادی لە خەیاڵی مەسعوود محەمەددا نەک هەر نامرێ، بەڵکو مردنەکەی، سەرەتای نەمرییەتی.

هەرگیز لە ژیانمدا، لە کاتی خوێندنەوە یا وەرگێڕان یا نووسین، ئەو هەستی مەستبوونەم نەبووە وەک لە کاتی وەرگێڕانی «دەمودووی هزر لە بەرەژانی مەرگی سەججادیدا» هەستم پێی کردووە. مەستبوونێک مەست بووم، گەیشتمە ئەوەی ئەملاوئەولای خۆم نەبینم و هەست بە بەرودوای خۆم نەکەم و پێکەنین و گریان لە ناخمدا پاڵەپەستۆیان بێ. هەستی پاڵەوانێکی وەک شەمشوونی مەزن، لە کاتی یەخسیری و چاودەرهێنانیدا... یا هەستی لە خاچدانی مەسیح بە بەر چاوی خواوە، لە ڕووحمدا سەریان هەڵدا. من خۆم بە چ زەریایەکی خەمدا کرد؟! لە بەر تیشکبارانی چ هەستێکدا ڕووت بوومەوە؟ ئەمە چ ئاگرێکە و یاری پێ دەکەم؟! مەسعوود محەمەد، ئەو بابەتەی بۆ مەرگی خۆی نووسیوە یا بۆ سەججادی؟! ئەو تاقگە هەڵڕژاوە لە کوێوە بۆ مەرگی سەججادی سەرچاوەی گرتووە؟ قەت باوەڕ ناکەم توانیبێتم ئەو هەستە بە کوردی دەربڕمەوە.

بەڵێ وشە مرۆ مەست دەکا و منیش بەو بابەتە، تا ئەو ئاستە مەست بووم کات و شوێنم لێ گۆڕان و کەوتمە ناو مەجلیسێکەوە، ئەمسەری سەججادی بوو و ئەوسەریشی مەسعوود محەمەد. ئەم دەیگوت و ئەو دەیسەندەوە و منیش کەڕوکاس، جارێ لە زاری ئەو ورد دەبوومەوە، جارێ لە زاری ئەم! مەست بووم بۆ مەزەی ڕستەیەک شایستەی مەقامی ئەو دوو کۆچکردووە بێ و نەبوو و نییە!

تۆ خاوەنی ئەم گەنجینە بەنرخە بیت و چاوت نەیبینێ! مەگەر ڕۆمانی «کیمیاگەر»ی پاولۆ کۆیلۆ توانیبێتی دەریبڕێ: لە ئیسپانیا، لە سەر گەنجینەیەکی ڕاستەقینە پاڵکەوتووە و خەون بە گەنجینەیەکەوە دەبینێ کە لە ئەهرامەکانی میسرە!! لە پێناوی گەنجینەی خەون، دەستبەرداری گەنجینە ڕاستەقینەکە دەبێ!!

لە کۆتاییدا دەڵێم: کاک ئاسۆس شەفیق و کاک کاروان عارف، زۆر بە هەڵەچنییەوە ماندوو بوون. ڕەنگە ئەوانیش تووشی ئەو گێژاوە بووبن کە منی هەڵلووشی. دەستیان خۆش بێ و لە وێنەیان زۆر بێ!

حەکیم کاکەوەیس
حەساری گەورە، کەرکووک، کوردستان 27/1/2013

**دەمودووی هزر لە بەرەژانی مەرگی سەججادیدا**

ئەم دنیایە جێی مانەوە نییە، جێگیرترین شتی لەناو دەچێ و بەهێزترین بەهێزی پووچە و تەواو نایجووین و قووتی دەدەین: یەکەم پەیوەندی بە بوونەوە هاوارێکی بێواتایە کە نە هیچ دەردەخا نە هیچ دەگەیەنێ، ئەوپەڕی بەردەوامبوونی سەرەوەی تەمابوون، یەک لێدانی پەندوڵی سەعاتی نێوان ئەبەد و ئەزەلە و جوانترین کۆتاییەکەی، چەمینەوەیەکی ئارامە بۆ بن ئەو خاکەی کە یەکەم جار لێیەوە هاتووە. بوونی نێوان هەردوو نەبوون (عدم)یش دەشڵەژێ و لێوارەکانی تەمەن دەقرتێن تا دەگاتە بەر دەروازەی ماڵاوایی (ڕووح دەگاتە کونەلووت) و ئاوڕ لە وێرانەی چۆڵوهۆڵی دوای خۆی دەداتەوە و دەبینێ چ زوڵم و خراپەیەکی کردووە و ئاوات دەخوازێ بگەڕێتەوە و بە ڕێیەکی تردا پێیدا بچێتەوە، بەڵام بە ئامانج ناگا و وەک تارمایی بەرەو غەیبی ترسناکی نەزاندراو دەچێ: ئای بۆ ئەو لەدەستچوونەی پڕ نابێتەوە و ئەو کۆتاییەی دەستپێکردنەوەی تێدا نییە و دەکەوێتە گۆشەگیرییەکی بن هەڵدێرەوە و خۆ بە جڵەوی درۆزنانەی هەڵەوە دەگرێ. خۆزگە بە تیشکێکەوە دەهاتە دنیاوە و دوای مردنی ڕوون دەکردەوە و عەترێکیش دوای مردنی بە دوایدا بڕوا و خۆزگە لرخەی سەرەمەرگ لە مردن دڵنیای دەکرد تا لە خراپەکاریدا لەسەرخۆ بێ و بەرەو چاکە هەنگاوی فرەوان بنێ و ژیان بە لایەنی ناتاریکی ڕووناک بکاتەوە و بە بێ ترس دڵنیا بێ و هیممەتیش دوور لە خراپەکاری ئاودان دەبوو. چ خەمێکی گەورەیە ڕێ لە چاکەی گونجاو بگیرێ و ئاسوودەیی نزیک بەند بکرێ و ئاواتی ئاشتی لە هەموو ڕووحێکدا تار بکرێ. وەی لەو هەناسەساردییە بۆ ئەو مومکینانەی دەستمان پێیان نەگەیشت، کە لە ناو زندوو و مردووەکاندا نموونەی لەبەر چاو و لەبەر گوێ زۆرن و تیشکیان داوەتەوە و ئاسوودەییان سەری کردووە و چاکەیان قوڵپی

داوە و تای تەرازووی چاکەیان لە هاوکێشە دژەبەرەکاندا قورس بووە: جەنگیز خان لە کوێ و عومەری کوڕی عەزیز لە کوێ و ئیبن حەمبەلی ناو بەندیخانە لە کوێ کە چەرمی پێڵاوی لە تەوێڵی جەللادەکەی بەنرختر بوو و چۆن بەراورد لە نێوان مینبەری عەنتەرە بە هاتوهاوار و هەڕەشەوگوڕەشەکان و مینبەری سەججادیدا دەکرێ، کە ئەمیان بە ڕووی مژدە و ڕووناکیدا کراوە بوو؟ یاخود دەڵێن ئەوانە سوننەتی کەون و پێویستی تەواوبوونن لە پێکەوەبوونی دژەبەرەکاندا؟ ئەوانەی بیانوو بۆ شەڕ دەهێننەوە و بەردەوامی بە توندوتیژی دەدەن و بازنە ونەکەی قەبووڵکردنی خراپە پڕ دەکەنەوە با لاکەون. خۆ خورپەیەکی هەستمان نییە بۆ بەردەوامی زەلالەت و پێویستبوونی دڕندەیی لێبدا ئەگەر بەشێکی ئیرادەمانی بۆ کاری ناشەرعی ئەهلی ڕابواردن و توندوتیژی زۆرداران کۆیلە نەکردبێ و بۆ لۆژیکمان برسێتی ڕووت و سەبری خۆڕاگر و بێنەوایی یەتیم و پارچەبوونی جەستە دانەڕێژرابێ، ئێمە خۆبەخشانە دژی هەق و چاکە و جوانی بە قەدەر تەسلیمبونمان بەوەی کە شەڕ ڕەگی لە یاسادایە و زوڵم لە سروشتی مرۆڤە و ناشرینی تێکەڵی وێنەکانە چەکدارین.

هەستی خۆبەدەستەوەدان بە واقعی خراپ وەک حەقیقەتی دەرەوەی بوونمان گەشە دەکا و لە هۆشی ئاگاییماندا دەبێتە تەسلیمبوون بە پێی مەرجەکانی و ئەوجا بازی خۆمان دەدەین و بە پێی پێویست بۆ لایەنە بەتامەکەی دەچین کە پەنابردنە بۆ فەساد و دەجەنگێزێین و دەهیتلەرێین و لەوەشە لە پەراوێز و دەستەی داوەتی گەورەدا بقەزەمێین و بەرماوە بلێسینەوە و تا بەدمەستبوون بخۆینەوە و ئەنجامی موبارەک نەبێ و کۆتایی ملی شکاوی ئەسفەلەسسافلین بێ.

سەیر و سەمەرە لە مرۆڤی ڕۆشنبیری شۆڕشگێڕی لۆژیکزانی فەلسەفەکاردا ئەوەیە وا بزانێ کە زانیارییەکانی، ڕاستییە مێژووییە زانستییەکان لە خۆ دەگرن و لە هەموویاندا یاسای گشتگیری تەواو لە سەر چارەنووسی هەر شتێ بەدەست دێنێ، کە بۆ ماددە بگەڕێتەوە و بەرژەوەند بیخوازێ و بارودۆخ

پێویستی بێ و هۆکاری هەبێ و ڕێڕەوە حەتمییەکەش لە کۆمەڵگەدا، بە دین و دنیایەوە و بە ئێستا و پاشەڕۆژیەوە مسۆگەر و دڵخۆشکەرە بۆیە نەخشەی بۆ دەکێشێ و قاڵبی بۆ دادەنێ و بە ماڵنجی لۆژیک ڕووەکانی لووس دەکا و چاوەڕوانی ئەو بەرەکەتەی دەکا تێربوون و ئاسایش و چاکە و تەمەندرێژی بە سەر خەڵکدا ببارێنێ و کاتێکیش لە دروستکردنی ئەو ڕوکنانە بووەوە و بیناکەی لە سەر تەواو کرد هیچی گەورە و بچووکی تێدا ناهێڵێ نەیژمێرێ. وەک شێت بزاوتنی ئارەزوو لە دەماریدا و ململانێی زەوتکردن لە تەماحیدا و چنگی ئارەزووی خواردن لە بەر دەستیدا و ئاراستەی بەرزبوونەوە لە هەنگاویدا و تێکەڵبوونی هەڵە لەگەڵ ڕەفتاریدا لە بیر نامێنن و هیچ هەوڵێک بۆ دامرکاندنەوەی هەڵچوون و کەمکردنەوەی هێزی و ئارامکردنەوەی گرکانە هەڵچووەکەی لە ناخی خۆیدا و لە پەیوەندیدا بە دنیاوە نادا: ڕەنگە بە خۆیدا هەڵبدا کە بە خۆ و بە هاوکێشە زانستییەکانی و پێوانە لۆژیکانەکانیەوە، خۆی هەموو بوونە و کۆگای مێژوو و ڕووی پێشکەوتنە، ئەوجا لە بیری دەچێ کە هیچی ڕاست نەکردۆتەوە و هیچی نەگۆڕیوە و تایبەتمەندی سروشتی خۆی بەرەڵا کردووە بۆ دەستبەسەرداگرتن و ڕابواردن و سەرکەوتن بە سەر هەموو بەربەست و ڕێدەرکردنێک، هەموو چاکی و پاکی و خاوێنی و پێگەیشتنی سەرجەمی مرۆڤایەتیشی بە خۆی بەخشیوە، بە دەستووری گشتی و بەرهەم و دابەشکردن و بەکارهێنان و شتی تری وابەستەی ئابوورییەوە، تا تۆڕی شیفای دەروونی و عەقڵانی و جەستەیی لە ڕێی کەناڵی خێرگەیەنەکانیانەوە کە بە ژمارەی دانیشتوانی هەردوو زەوی دەبن، ئەگەر بە ڕاستی بیەوێ شەهوەتی خۆی لغاو بکا و بەربەست بۆ ئارەزووی خۆی دانێ، دەچێ بەر لە سەرکەوتن، بەربەست بۆ فێڵەکانی خۆی دادەنێ و چاوەڕوانی بەرهەمی پرۆژە دوور و درێژەکە ناکا کە دوای دەیان ساڵ شیفا و پاکی و ڕوونی بەرهەم دێنێ، چونکی لە باشترین حاڵدا و سەرکەوتووترین ئەنجامدا تۆوی ئاسایش و ڕاستی لە ویژداندا دەچێنێ و خۆ ئەو تۆوە بە بێ پرۆژە و دەستووریش، بۆ خوازیارانی خۆی هەیە ئەگەر نیەت پاک بێ و گەشەکردن بە بەر چاویەوە دەستی پێ

کردبێ و لە ناخیدا چرۆی کردبێ. ئەوجا خۆ هیچ نەگونجانێک لە نێوان چاکەخوازی گشتی لە سەرچاوە فرەوانەکەیەوە و کورتکردنەوەی ڕێگای چاکەخوازی بە پاککردنەوەی ئارەزووی چارەسەری ڕاستەوخۆدا نییە، ئەوەی لە بەڵگەنەویستەوە نێزیکە هاوتەریبی هەردوو چارەسەرەکەیە و هەردوو جیهادیش بۆ تێکشاکاندنی بەربەست هاوکاتن، چۆن هەڵدەکەوێ تیشک بخرێتە سەر دنیای عەقڵێک کە لەبەر تاریکی خۆی کوێر بووە و ڕاستی وەعزدانی بنیادەمێک لە کوێیە کە لە ئەرکی خۆی هەڵدێ و چۆن گوێ لە ڕێنمایی پزیشکێک دەگیرێ دەرمانی خەڵک دەکا و بەخۆی نەخۆشە! خەڵک تاقەتی دەسەڵاتی خوێندەواران و لاملی فەیلەسووفان و نازوفیزی شۆڕشگێڕانی سەر شۆستە و گۆڕەپان و هۆڵەکانیان نییە، تا بە دەم عارەقەدەردانەوە، لە کارگە و شوێنی مانگادۆشین و کێڵگەدا بەیانیان و ئێواران چاوەڕوانی پێگەیشتنی نەمامی دارخورمای بەڵێن بن تا خورمای زۆریان بە سەردا بباریێ، ئەوەش دوای ئەوەی ئێسکیان لە گۆڕدا دەڕزێ.

خەڵک زیاتر پێشوازی لە لابردنی قورسایی ئەو ڕۆژەی سەر شانیان دەکەن و بۆ سبەینێش هەزار کڵاو بە بایەک و کەمتر بەرگەی ئەو تەنگوچەڵەمەیە دەگرن کە زۆردارێک لە سەر زاری قامچییەکەیەوە، بەڵێنی فەلسەفاوی دەدا و ئەوەش یەکێکە لەو ڕاستییانەی مرۆڤ کە دەوام بە خەسڵەتی مرۆڤانەی دەدا و هەستی قەبووڵکردن و ڕەتکردنەوەی پێ بەردەوام دەبێ و ئەگەر بمرێ یا لە ژێر چەوساندنەوەدا وێران بێ، دەبێتە ئامێری قورمیشکراو و هەر کاتێ چاودێرە دەسەڵاتدارەکەی کلیلەکەی بسووڕێنێ دەیبزوێنێ. «سەججادی»ش لەگەڵ هەموو بارودۆخەکانیدا، خوێندکاری قوتابخانەی وابەستەبوون بوو بە مرۆڤایەتییەوە و بە بێ هاتوهاوار و خۆبەزلزانین و ناهەقیخوازی، ڕێبازێکی وەهای تێدا گرتە بەر هەر شایستەی پایەداران بێ. لە بەرنامەی خۆیدا نموونەی وای هێنایەوە هەر کەسێک پێیدا تێپەڕێ و چاو لەو بکا خاوێنی بەدەست دێنێ و چاکە دەبارێنێ و لە کەرامەتدا بەرهەمی دەبێ و بە ئاسوودەیی دەگا و بەڵکو مەیدانی زاڵبوان بە سەر ئیرادە و

دەسەڵاتداری سەر چارەنووس تەنگ دەکا چونکە لەشکری ئامادەی تێکشکان، چ لە زاد و چ لە چەک، لێی کەم دەبێ ئەگەر لە بەرانبەردا خۆڕاگری و بەدەنگەوەهاتن و جیاکردنەوەی نێوان چاکە و خراپە هەبن و لە هەڵبژاردنی بەدکاری و چاکەکاریدا ئازاد بن. ڕەنگە ئەوەش ڕاست بێ کە لە جیهادە بەردەوامەکەیدا شێوازێکی گرتبێتە بەر کە لە گەڵ سروشتە نەرمەکەیدا هاوئاواز بووە و بە شێوەیەک لە شێوەکان لەگەڵ تێکۆشانە ئاشتیانەکەیدا یەکیان گرتووە و گەیاندوویانەتە ئەو ڕێیەی کە غاندی لە هند گرتیە بەر، لەگەڵ جیاوازی هەردوو بارودۆخەکە و توانای هەردووکیاندا کە زوو بەر چاو دەکەون و تیایدا بیانووی سەججادی لە کەمی دەسەڵاتیدا دەبینی و بەوەش گەورەیی ئیرادەی سەججادی بەدی دەکەیت لە ماوەی حەفتا ساڵی نێوان یەکەم دەرسخوێندنی ئاینی لە منداڵیدا و دواڵیدانی دڵی لە بەردەم کتێب و نامیلکە و دەفتەرەکانی، لە گەردەلوولی خۆی و ناو ماڵەکەیدا. ئەو، لە سەر ڕێبازی چاکەکاری کە بەر لە هەزاران ساڵ چەکەرەی کردووە، بەردەوامبوون بوو لەگەڵ بەردەوامبوواندا و سەرەداوێکی ڕێنیشاندەری لە داوی مینبەرە ڕوونە بەرزەکانی ئیسلامەوە بەرەو ڕاستی گرتە دەست و تیشکی زانایانی «زاهیر» و کورتەی زیادەی «باطن»ی تێدا کۆبوونەوە و لە ئیرادەیدا عومەر و عەلی یەکیان گرت و شافعی و حەلاج شەڕیان کرد و لە چنینیدا حەنەفی و نەقشی تێکئاڵان و لە ئاگاییدا شارەزووری و کاک ئەحمەد هاتنە زمان و لە ئاوازی حەقی ئەوانەوە دەفەکانی هاوئاواز بوون و لە میحرابیاندا گاگۆڵکەی کرد و لە باغیاندا گەورە بوو و لە پیریدا بە مەیدانیاندا تێپەڕێ، قەڵەم لە دەستیدا جێی نارنجۆک و چەقۆی گرتەوە و هەڵاوی قسەی پاڵێوراو و دەربڕینی بەرز و بەلاغەتی ڕەوانی ئاڕاستەی جێی مەبەست کرد: دەستلێدانی شیفا بوو و چپەی شیرین و مەشخەڵی ڕوونکەرەوە بوو. ڕازی ئەم تێکەڵی ڕازی ئەوان بوو و گەرمایی باوەڕیان بە دەماریدا دەگەڕا و لە ململانێی نەفس و لادانی لە ئارەزووی قورس و بەرزبوونەوەی سەرشۆڕانە و پاڵنانی بە ڕێی ڕاستی بە سکەی دڵنیاییدا بە پێی حەماسەتی ئەوان چالاک

بوو تا دەگاتە ڕایەخی زەوی و خەوی داخستنی لاپەڕ، بە نرخێکی کەم بۆ بەرزبوونەوەی پلەی ڕەوشت بەرەو بەرزایی بەرچاو کە جێی کەوڵکردنی نەفسە لە کەوڵی تەماح و لە ناو قۆزاخەی قەناعەتدا گرمۆڵە بوو و خۆی بە پێخەفی قەناعەت و ڕازیبوون بە چارەنووس پێچایەوە. لە سەرەتای تێکۆشانیەوە، ڕۆژگار هەڵیپێچا و بارودۆخ بە ناو دەشت و شاخدا تووڕیان دا و بە گوند و شار و لای ڕەوەند و نیشتەجێبووی کوردستانی عیراق، بە دۆڵ و شاخیەوە و بە بەردەڵان و تەختاندا هات تا لە بەغدا گیرسایەوە و بە مانگانەیەکی کەم لە مزگەوتێکدا ژیا و لە بەرەکەتی چالاکییەوە، بەرەو سەکۆی ڕۆشنبیری و خانەی چاپ و بڵاوکردنەوە چوو و خۆی بە سەر دوو لای مەزندا دابەش کرد: لە ڕووی وەفاوە، لایەنی ڕۆشنبیری کوردی کە ئینتیمای بۆی هەبوو و لە ڕووی باوەڕەوە خزمەتی ئیسلام کە باوەڕی جێگیری پێی هەبوو. لە بوونی خۆیەوە لەوە زیاتری پێ دەبەخشین کە بۆ خۆی دایدەدۆشی. نە ئەوە و نە ئەو گەڕانەی بە ناو نووسیندا، لە کۆکردنەوە و دانان، نە گەڕانەوەی بەرەو بێشکەی منداڵی و مەیدانی سەردەمی پیاوەتی لە سەر خاکی کوردستانی قەڵەشبردوو بۆ خۆیانم ڕادەکێشن و لە ئاستیدا کەمتەرخەمم. قسە لە سەر ئەوە کراوە و قسەی زیاتریشی لە سەر دەکرێ و هیچی شاراوەی نییە پێویست بە ئاشکرابوون بکا و خەسڵەتی دیاری لە ناو خەسڵەتە جیاکەرەوەکانیدا بەردەوامییەتی لە سەر ڕەوشتی شوکرانەبژێری و خاوێنی لە تەنگوچەڵەمەکانی ژیان و زاڵبوون بە سەر ئارەزووبزوێنەکانی تەماح و پایەدا. لە ناخۆشیدا ورەی بەرنەدا و لە لێقەوماندا لە هیچ ڕوویەکەوە نەرم نەبوو و جلی ڕێزلەخۆنانی پینە دەکرد و لە هەموو تەنگوچەڵەمەیەکدا نەفسی بەرزی، بە ئاسانی شانبەشانی سروشتی خۆی دەڕۆیی تا لە بەر هیدایەتی ئیسلامدا تا ئەو شوێنە بڕوات کە هەڵکەوتووە کۆنەکان دایانناوە. من وای بۆ دەچم لەگەڵ ڕەوشتە باسکراوەکانیدا، لەگەڵ کتێبان ئولفەتی گرتبێ و لەگەڵ بەباشە باسکردنی بارودۆخیاندا ڕاهاتبێ بۆیە سروشتی بەرەو نیشانەکانی ئەوان داشکا و نەفسی ویستوویەتی کەمێک لە خەسڵەتی ئەوانی

هەبێ، لەبەر ئەوە چنگی لە عەمامەکەی خۆی گیر کرد و بای سەردەمایەتی و نوێگەرایەتی لە سەریان نەفڕاند وەک لە سەری لەو باڵابەرزتریان فڕاند. ئەگەر نەشیتوانیبێ لە دەریای زانست و بەرزبوونەوەدا لەوان نزیک بکەوێتەوە، ئەوە تۆڵەی بۆ کردبۆوە بە ڕێی ئەو شەرعەدا بڕوا کە بۆ شوێنهەڵگران کرابۆوە و بە دوای ئەو ڕووناکییەدا بچێ کە بۆ شوێنکەوتووان داگیرسابوو و ئەوەش لە کورتکردنەوەی ڕێگادا بەرەو زیارەتگای کەرامەت ئاسوودەی کردبوو و چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بوو بەڵێنی فەیلەسووفەکان بێنە دی کاتێ برسێتی نامێنێ و دادپەروەری هەموو جێیەک دەگرێتەوە و جیاوازی ئاغا و مسکێن نامێنێ و ڕەوشتی خەڵکی ڕاست بێتەوە و حیکمەتیان پێبگا. خۆی خستە بارێکەوە، خۆ لەو چەوتییانە لابدا کە دەستکورتی و بڵاوبوونەوەی زۆرداری دەیانسەپێنن، ئەوەش بە باوەڕێکی مەعنەوی ناخی کە بە درێژایی تەمەن لە گوڵەگەنمی حیکمەتی خەرمانی کەلەپوور کۆی کردبوونەوە و دەنکە گەوهەری پەرتبووی ناو گوتەی پێشینانی خاوێن کردبوونەوە و خستبوویە سەری و نە بیانووی هێناوەتەوە و نە شەرعی کردۆتە پێوەر، نیەتی لە هەقخوازی خاوێنی بێ بیانوو و مەبەستدا ڕاست بوو و بە سووربوونی کەسێکەوە دووی کەوتبوو کە ڕۆژی ئەمان و دڵنیایی و خۆراک لە کاتەکانی خۆی دەسرێتەوە و نەفسی خۆی دەخاتە ژێر ئەرکی وابەستەبوونەوە بە ڕێبازێکی وەک تاقیکردنەوە قورس، کاتێ بە هەژاری هیممەت بۆ ململانێی تەماح هەبێ و بە لاوازی ململانێی زۆرداری بکا و لە شوێنی ناخاوێندا گرنگی بە پاکژی بدا. هەی قوڕ بە سەر قەڵەمەکەم کە خەریکە بەرجەستە بەڵاکانی دەنەخشێنێ لە کاتێکدا بیرم دەکەوێتەوە کە بە خۆی و دین و باوەڕ و عیرفانیەوە پەنا بۆ مزگەوتی تەنیشت حەیدەرخانەی ڕووەو مەیدان دەبا و کاتێ بەرەو میحرابی ئەمان پێچی دەکردەوە، ئەو بیست هەنگاوەی کۆتایی تا بەر دەرگای مزگەوتەکەی بە ڕاکردن دەبڕی و هەنگاوەکانی پەنابردن بوون بۆ خوا لە دەست شەڕی خەلقەندەی خوا و پەنابردنی پەناخواز بوو لە دەست فیتنە بۆ کوێر و کەڕ و لاڵ و ڕێبڕین بوو بە ناو دۆڵی ئاگردا بەرەو

سەلسەبیل. چلەکان و پەنجاکانی لە بەرزەخی دیار دەرگای کراوەی فەسادخانە بەرێ کرد و جێی گزنگی نێوان دوو دژەبەری گرتبۆوە.

ئۆف لەو ژیانەی بە گرانترین ناخۆشی لە توانابەدەرەوە خۆڕاگران تاقی دەکاتەوە و توانای بەربەرینی خۆڕاگری سەججادیش ئەوە بوو بۆ مەسەلە بەڵاکان بە قەدەر خۆڕاگری شەهیدان بوو و بە پشوودرێژییەوە ئاوبارەی گوڵی ناو دڕکی چنییەوە تا بیکاتە پێخۆری ڕۆح و دڵخۆشی بینەران وەک نیشاندانی هەوڵی بەردەوامی بۆ بەخشینی بەردەوام بە ڕێی ڕاستدا. ئەو کەلەپوورەی ئەو هەڵیگرتبوو تۆڵەی ماڵی بۆ کردبۆوە و بۆ پێکانی ڕاستی پێیگەیاندبوو و بۆ هاوسەنگی ئارامی کردبوو و بەو ڕۆشنبیرییەی لە بواری باوەڕدا پێشکەشی کرد لە هەموو بابەتێکدا بەری چاوان ڕوون دەکاتەوە و بوو بە بەڵگەی بەرپەرچدانەوەی هەر بۆچوونێک کە سووککردنی کەلەپوور دەکاتە بناغەی باوەڕ و هاندەری چالاکی و بناغەی چوون بەرەو جیهاد و سەرکردەی بەها باشەکان. کەڵەکبازی، زۆر لەو هیممەتانەی ماندوو کرد کە لە ڕۆشنگەری و چاکەکاری و دڵسۆزیدا خۆیان بە کەرەسەی دنیا پڕچەک کردبوو و دوایی کاتێ دیدتیان مەودای نێوان گەورەیی ئامانجی پەیامەکە و ئەو نەختە ئەنجامدراوە و نێوان بەڵێنەکان و ئامانجەکەدا چەند کەمە، شکست دڵی شکاندن و لە ڕێبازی گەیاندنی پەیام لایبردن. بە پەیدابوونی ململانێ بەرانبەریان توندوتیژەکان خاو بوونەوە و تێکشکان و چەندین مەودا کەوتنە دوای ئەو جێیەوە کە قوتابخانەکەی سەججادی لێیەوە لە کاروباری ژیان و ماڵ و گواستنەوە دەڕوانێ. بارودۆخ، بە دەم بەرەژانی قورس و توند و ناجێگیرەوە، بە لای ڕاست و بە لای چەپ و بەرەو ناوەڕاست جێگۆڕکێی بە ڕۆشنبیران کرد و خوێنی لەبەر چوو و کۆرپەڵەش هەر دیار نەبوو تا لە ئەنجامدا ڕیزەکان تێکەڵ بوون و سنوورەکان تێکئاڵان و چەپ لە چەپی چەپ بزر بوو و ڕاست دروشمی وای هەڵگرت کە چەپ سڵی لێ دەکردەوە و ناوەڕاست لێی دەترسا و مەنجەڵەکان بە شیددەت کوڵان و بە نێوان ناوەڕاستدا بانوبنیان پێ دەکردن و بانیان خستە بن و بنیان خستە بان.

سەججادیش لە ناوەڕاستی تەمەندا لە ناو ئەو گەرداوەدا وەک ڕوکنێکی بەهێز وەستا و سەرچاوەی هێزی لە شوێنی ڕواندنیەوە بوو: ڕەسەنایەتییەکی تێدایە و هەڵناکێشرێ و نەرمییەکی تێدایە و ناشکێندرێ و بەرێکی ئەوتۆی هەیە کۆتایی نایێ و ئەو ئاگرەی لە بن پێیەکیدایە، بە پاڵنانی دەوروبەری لادەکەوێ: سوێند بە باوەڕ، ئەوەی لەو گەرداوەدا هێشتیەوە گورزەیەکی تیشکی فورقان بوو و بە قەفێ لە هەواڵی موحەممەد و یارانیەوە پێچراوە و لە بەر ڕۆشنایی هیدایەتی خیتابدەران و نووسەراندا لە پتر لە سێزدە سەدەوە نیشانە و فەرمانی هەڵکەوتووانی هەقی لە سەر بوو و هەموو مردن و «هیچیشیان نەگۆڕێ».

ئەی سەفەرکردووی دانەبڕاو.. ئەی دابڕاوی بێ پەردە! وەهمم بە چ خەیاڵێکدا ڕۆچووبوو کاتێ نەمدەزانی بە مردوێتی لەوە زیاتر لەبەر چاوانی کە لە ژیاندا بوویت. بۆ کەسێک سەبری هەبا، لە ژیانتدا مەودای تەمابوونی دیتن هەبوو بەڵام دوای مردنت لە ڕووحی کەسێکدا بە تەمای دیدارت بێ بوو بە تینوێتی.

لە ئاواتی ئاواتخوازانتەوە لاتدا و بۆ ئەوانەی شەیدات بوون بووی بە بێهیوایی و بە مردنت پەیوەندیت بە هاوڕێیان و خۆشەویستانتەوە بڕی جا چ کوردەکانت بن چ عارەبەکانت، تۆ بە هەوڵی کەسێک بۆیان بوویت کە جگە لە خوا نەمریان بکەیت و ئەوان و لە بری تۆ دڵۆپی عەسەبیان لە بەرانبەر کۆسکەوتن بە سەبر ڕاگرت. بە قەدەر وەفات بەرانبەر بە مردن، ئولفەتت لەگەڵیدا هەبوو و دڵسۆزیت بۆ مەرگ بە دەستبەردان بوو لە نوێژ و بە وازهێنان بوو لە دواکەوتنی خەڵک و دانەوەی مافت لە لایەن مردنەوە لە ئەستۆی هاوڕێکانتدا وایە کە سووتەمەنی بۆ بەردەوامی بیریان بۆ تۆ زیاد بکەن و بە باسکردنت درێژە بە سووتانیان بدەن و بۆ لایەنگیریت وزە بە عەسەبیان بدەن. ئەگەر لە سەر ڕێگات چاوی تەمام خوێناوی بووبێ و گوێی ژنەوتنم کەوتبێتە بەر ڕەوتی تۆ و لە پێناوی لەخشتەبردنی نەفس بۆ بزربوونت پەردەی مەرگ بۆ خنکاندنی تەما بەرز بووبێتەوە و جۆرەها ئاواتی

پەرت کردبێ و کردبێتیە بێهیوایی یادی جێگیری تۆ نەبووبێ لە ویژدانمدا، خۆی لە خۆیدا ڕووناکاییە و بە باسکردنی لە سێبەری مەرگدا درەوشانەوەی زیاد دەکا: وەک باران بە ژمارەی تابلۆکانی دادەکا و بە قەدەر ڕوونی ناوەڕۆکی زیاد دەکا و بۆ پێوەری بێگەردی لایەنگری لە ژیاندا ئاشکراتر دەکا و لە دەستێکی ئەمیندایە و بە ئاڕاستەی ڕاستەقینەی خۆی نەبێ بە هیچ لایەکدا لایناداو بێباکی، مەرگ وەک بەڵگەی دەوامداری و مەبەست و لایەنە شاراوەکانت تۆی بۆ جەوهەری خۆی گێڕایەوە.

ئەم قەڵەمەش کە مەرەکەبی وەک نوور هەڵدەڕژێنێتە ناو دێڕەکانتەوە و لە مەیلیدا داچۆڕانێکی خاوێن هەیە، نەیتوانی پەنا بۆ بەڵگە بەرێ، چونکە سوێند بە «نون و قەڵەم» و ئەوەی دایدەڕێژن شێوازێکی ترم بۆ دەربڕینی دڵسۆزی بۆ زیندووان نەدۆزییەوە لە ڕاستگۆیی نووسین باڵاتر بێ و لە وەهمیشدا بە بیرمدا نەهاتووە وایان ناشرین بکەم بادانەوەم لە دەربڕیندا ناشرین بکا و هەموو تەمەنم ڕووی زارم لە ڕەگێکی خێرخوازیان بووە تا بەرانبەر ڕەگە شەڕخوازەکان هانی بدەم کە لە ناخی نەفسی خراپەخوازیاندا بووە. خۆشت دەزانی کە وشەیەکی هەق بۆ کەسێک چاکەی لەدەست بێ ڕێگرە لە بەردەم خراپەکاری. ڕەنگە هەڵکەوتێک بیرۆکەی چاکەی گەیاندبێتە ناخی بەئاگا کە جێی لەوە زیاتری لە چاکان تێدا دەبێ کە بۆی دەچین و لەو بارەدا ڕێلێگرتنی، دەبێتە لەدەستدانی ئەو نیعمەتە گەورەیەی دابڕاندن کوشتوویەتی. کە قسەی دڵسۆزان نەگاتە بەر گوێ نابێتە دەستخەڕۆیی بۆ کەس ئەوە نەبێ نیەتی چاکەی قسەکەر بێ بەرهەم دەبێ، دەشزانی ڕووی قسەم لە بێدەسەڵاتی ڕەنجدەر نییە تا خۆراکی خۆی پەیدا بکا کاریگەریم لە سەری مەگەر ئەوە بێ کە ئیشتیای لە نان و هێلکەکەی یا نان و پیازەکەی کەم بێتەوە و ئەوپەڕی هاندانم بۆی لە ئازاردانی ڕێگا دوور بێتەوە چونکە هەرچۆنی بێ ئەوەی دەنووسرێ نایخوێنێتەوە و بشیخوێنێتەوە تێیناگا و لە کوردیدا بزر دەبێ و ڕەنگە لە عارەبیشدا دڵشکاو. مادام عەزمی من لە سەر ئەوە جەزمە کاریگەریم لە سەر خەڵکی هەبێ بە پێی پێویست پەرۆشم بۆ

کاریگەری سەر عەقڵی ڕوونی بن تەوێڵە بەرزەکانی نێوان شانە کاریگەرەکان چڕ دەکەمەوە کە سامیان هەیە و ئاوات بۆ پێگەیشتنیان دەخوازرێ. شایستەی یادی تۆیە لە کورتە باستدا خەیاڵ بۆ ئاستی مەقامت، لە چاکەخوازی و نارەزاییت لە خراپەکاری و چاکەت بۆ بێگانە و خوێش و شتی لەو بابەتانەی خەسڵەتی باڵات بەرز بێتەوە کە یادیان تروسکایی هیوا پەیدا دەکا کە سەبووری بێ و پێویستی بە هەڵگرتنی شوێن پێت زیاد بووە تا ڕەچاوەی (بە چاکە تۆڵەی خراپە بکەوە) بکرێ و بە سەر خراپەدا باز بدرێ و چاو لە هەڵە بپۆشرێ و بە سەهوو و بیرچوونەوە لێکبدرێتەوە، تۆ هەوڵت دەدا بۆشایی پڕ بکەیتەوە و مەودای نێوان دڵە لێکرەنجاوەکان نزیک بکەیتەوە و بیانووی خەتاکردووت دەبردەوە بۆ دەوروبەر و داوای لێبوردەییت بەرانبەر خراپە دەکرد و بیانووی نییەتباشی یا هۆکارێکی سەرووی ئیرادەت بۆ دەهێنایەوە و خوداش چاوپۆشیکەر و بە بەزەیی بوو.

ماوەی پتر لە چل ساڵ لە نزیکەوە دەمناسیت و سەرەتای ئەو ساڵانە لە ناو جەنگی دووەمدا بەسەرچوو و ئەوی مایەوە لە ئاشتییەکدا بەسەرچوو لە دڵەڕاوکێدا بوو و لە نێوان دڵسەغڵەتی و دڵخۆشیدا دەهات و دەچوو، لە کۆڕی زانیاری کوردیدا حەوت ساڵان هاوڕێیەتیم کردیت و پێکەوە دەمانچاند و دەمانگوشی و شەومان دەدایە دەم ڕۆژەوە و دەمەتەقێمان لە بارەی ئەرکەکانمانەوە لە کۆڕ و ئەو ڕێیە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییانە دەکرد کە لێی دەبوونەوە و لە دەرگای هەموو قسەیەکمان دەدا کە جێی زانستی سەردەمی لێ ببوایەتەوە و تۆڕە ئاڵۆزەکانی بەرهەمیان بهێنابا و قسەمان لە سەر وردترین و هەستیارترین بابەت دەکرد، لە دینەوە بگرە تا سیاسەت و باوەڕ لە ژیاندا و ڕێگەچارە: مەودای دووری قسەکردنمان بە هەوراز و نشێودا بڕی و خۆمان لە لێواری ڕاست و چەپیان دا و بە ئاشکرا و بە نهێنی خومان لە قووڵاییاندا نقوم دەکرد و هەرگیز هەرگیز هەرگیز نەمدیتی لە لۆژیکی زانایەک لا بدەیت لە بۆچووندا لە سەرخۆ و نەرم بێ و یەک جاریش دەنگت لەوە بەرزتر نەبووەوە کە سروشتە ئارامەکەت ڕێی پێ دەدا و

لەوەش زیاتر ڕێزگرتنی هاودەمێتی ڕێی نەدەدایت. ئەگەر لۆژیکێک کە پێی دڵخۆش نەبوویتایە و بێزاری کردبای جگە لە جێدەستی شڵەژان کە بە پەنجەکانتەوە دەردەکەوت کاتێ سیغارت بە تووتنی «باڵەک» و «شاور»ەوە پێ دەپێچا و بە لەرەیەکی دەنگت لەگەڵ دووکەڵی جگەرەکەتدا بە بات دەدا، چ کاریگەریت پێوە دیار نەدەبوو. خوا لەو دوورییەت لە زەبروزەنگەوە خۆش بێ: لە کەم کەمتر و لە دەگمەن دەگمەنتر بە شێوەیەک گوێم لە دەنگی بەرزت بووە ختووکەی عەسەبم بدا تا لەم خەمەم کەم بکاتەوە و هەندێ لەم کارەساتەم هەڵمژێ. نەدەکرا بەشێ لەو چاکییە ڕەها فرەوانەت بۆ خەسڵەتی ئاسایی نەرمونیانی و توندوتیژی تەرخان بکەیت تا لەم دابڕانەت دەستم بگرێ؟ لە قورسی مردنتدا فێڵ لە خۆم دەکەم تا تۆڵەت لێ بکەمەوە تا کاریگەری مردنت لە سەر پێست و خەیاڵم کەم بێتەوە، ئەوەش بە گەمەکردن لەگەڵ وشەدا و ئەگەر باسی ساکاریت بکەن، بەوە بەرپەرچیان دەدەمەوە کە لە بەرزیدا بە سەر پایەداراندا دەشکایتەوە و باسی دنیانەویستیت بکەن، من بە داهێنانەکانت بەرپەرچیان دەدەمەوە. کە باسی بەهێزیت لە ئەدەب و کار و ڕەوشتت دەکەن، بەو بەهێزییە بەرپەرچیان دەدەمەوە کە بۆ چاکەخوازی و ڕێز و ململانێت بۆ چاکە دەستت بە سەردا گرتبوو و وەهات باس دەکەم کە لە هەوڵی ورووژاندنی چاکەدا بوویت و کۆکەرەوەی خەسڵەتی بەرز و خوازیاری دنیایەک بەهای بەرز بوویت کە درەوشانەوەی دوڕ و یاقووت و خۆبادانی زۆرداران و زاڵمان لە دوایەوەن. بەو تەماحە بەرز و پاکەش تۆمەتبارت دەکەم کە لە تەماحی ئەو بەخیلەی تێپەڕاند کە بۆ کۆکردنەوەی زێڕ هەیەتی و ئەی خوایە لەو سەفەرکردووەی کە بە عەتری گوڵی خۆی کاریگەری هەیە و لە سەر کەمالی خۆی لۆمە دەکرێ و بە هۆی جوانترین خەسڵەت و شێوازیەوە لۆمە دەکرێ. چ مردوویەکی بەرزە کە هەر بە زندوویی بە چاکەکاری سوپاسگوزاری بۆ مایەوە.

لە دەمەتەقێکانماندا ئەو ڕێبازەتم بۆ دەرکەوت کە چۆن وەڵامی دەستدرێژی دەدەیتەوە و بەرپەرچی هێرشبەر دەدەیتەوە و ئەوەشت لە ڕێبازی «ئەبو زەڕ» بۆ مابۆوە کاتێ دەمپیسێک جنێوی پێ دا، گوتی: «کابرا جنێو مەدە و باییی ئاشتی بهێڵەوە، خۆ ئێمە لەوە زیاتر خەڵاتی کەسێک ناکەین بە هۆی ئێمەوە لە خوا یاخی بێ کە بە هۆیەوە گوێڕایەڵی خوا بین». تۆش توانات بۆ بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژیکەر، بە پێی زیادەڕۆیی بێئەدەبی ئەو پەک دەخست. تۆم دیتووە هۆکاری ڕوونەدانت بە هەندێ کەس باس کردووە و هۆکارەکان نەگەیشتوونەتە جێی باوەڕپێهێنانم، بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا کاتێ جەوهەریم بۆ دەرکەوتووە ئەوجا زانیومە چ هەوڵێکت لەگەڵ نەفسدا داوە تا خراپەکانی باس نەکەیت و ڕەنگە من بوایەم هەر لە سنووری قساندا جێم کردباوە و ئەگەر پێوانەی ڕەوشتیم بۆ بکرابا، قسەم لە سنووری مەدح بوایە. خوا لەو خۆش بێ و خێری تۆش بنووسێ.

خەسڵەتێکم لێت بەدی کرد لە هاودەمێتیدا تاجی سەری چاکەکانە و ئەگەر ئەوە لە هەموو کەسدا هەبوایە، بە تایبەتی ئەوانەی کاریگەرییان هەیە، زۆر لاپەڕەی مەترسیداری موسیبەت و کێشە دادەخران، مەیلی سروشتیت بۆ ئەوە پاڵی نابووی لێکحاڵیبوونت پێ چاکتر بێ لە ململانێ و باوەڕی بنەڕەتیت وای لێ کردبوویت نزیکبوونەوەت پێ باشتر بێ لە بەرەنگاری ئەوەش بەرەو بینینی شتێک کە چاوی پشکێنەر نایبینی و هۆکاری ناتەبایی و دووبەرەکی بوو. بۆ تۆ وا هەڵکەوت ئەو خاڵەی دوو لایەن لە سەری لێکدادەبڕێن لە ڕاستیدا خۆی لە خۆیدا خاڵی کۆکەرەوە بن و خاڵی دوو داوی توند کە لایەکانی لێک دوور دەکەونەوە چەقی پێکگەیشتنی هەر چوار لایەکانە. بە قەدەر ئەوەی ئەو چوار داوە درێژ ببنەوە، بەرەو مەودای بێکۆتایی لێکیش دوور دەکەونەوە و ڕەزامەندییان بۆ بەرژەوەندی بەردەست ئەوەیە کە لە یەک خاڵدا یەک دەگرنەوە و کۆتایی بە سەربڕین و کەوڵکردن و پارچەکردنی ئەندامانی لەشی مرۆڤ بێنن.

من نالێم ئەو بۆچوونە ئەنجامی فەلسەفەیەکە لێیەوە لە ئەنجامگیری خۆتت ڕوانیوە و بەردەوامیت بە تاقیکردنەوەی خۆت داوە چونکە هەڵوێستێکی وات نەبوو کاروبار بەڕێ بکەیت یا بەشداری ڕووداوەکان بیت و بە زەبری شەپۆل گەڕابیتەوە ئەو کونجەی خۆت کە پێی ڕازی توویت و ئەوەندەت بەس بوو بەشداری هەستی خاوێنی خەڵک بکەیت و ڕێنمایی چاکە بەوانە بدەی کە ویستبێتیان و پێت هەڵسوڕابا چاکەت دەکرد و لە خەمباری گشتیدا دادەنیشتی و دەگریایت و لە ئاهەنگدا جێیەکی دوورەدەست دەگرت، ئەوەش کارێکی نائاگایی ڕاستە کە جیاکەرەوەی نێوان خۆشی و ناخۆشییە، کە لە بەندی فەلسەفەی هەڵوەشاوە ڕەتکەرەوەکانی لەشساغی و تەندروستی دەرچووە و ئەوانەش بە ئاسانی لە تۆدا درکیان پێ دەکرا چونکە هاوئاهەنگی لە نێوان شوێنەواری بۆچوونی نائاگایی تۆ و بەرزی پلەی خەم لە باوەڕی مندا هەبوو. هیچ ناکۆکییەک لە نێوان دوو ناکۆکدا نەبوو، بە دەگمەن نەبێ، ئەنجامی پێکهاتن نەبووبێ و ویژدانی زندوو بە دەوریدا گرد نەبووبنەوە و نەفرەت و زویربوونت لاخستبوو و ئیزنی تێپەڕبوونت وەرگرتبوو و گەیشتبوویتە شوێنی تەبایی و ئاسوودەیی ئاشتی. لە هەموو نەگونجانێک مرۆ قوربانی بە بەرژەوەندی خۆی لە پێناوی ئاسایشی خۆیدا دەدا و چاویشی لە تای تەرازوو و زەرەر و قازانجی ئاڵوویرە، پاشەکەوتکردنی قازانجی گەورە لە سەرفنەکردن بۆ وێرانکاری و وەستاندنی ڕشتنی خوێن لە کاتی ململانێ و لەدەستدانی بەرژەوەندی و نەهاتی بازرگانی و وێرانبوونی بنیادگەری «بیری پەککەوتوو و کۆشکی دروستکراو» و ئەگەر نەفسەکان بتوانن دادوەری لایەنگرانە لە بەرژەوەندیدا ڕسوا بکەن بۆ ئەوەی ناکۆکی بەرپا نەبێ و دەست لە ئارەزووی تێکشکان و ناچارکردن و داواکاری زیاد هەڵبگیرێ و ڕووناکایی ئامانج لە هەق و بەشی مومکین بە هەند وەربگیرێ، بیانوو و هۆکاری زەوتکردن و شکاندنی ئیسک و بڵاوبوونەوەی زوڵم و ئاگرکەوتنەوە نامێنن، مەگەر لە سەر ناتەبایی بەرژەوەندی ڕاستەقینە کە بە پێی یاسا و بۆچوونی ئەم سەردەمە ڕێکەوتن لە سەری ناکرێ و لەو ڕووەوە کە شەڕێکە و

خۆلێلادانی نییە، یەک بۆچوونمان لە سەری هەبێ تا ڕەوشتی گشتی هەنگاوێکی تر بە نیەتی لە تەماح و زەوتکردن باڵاتر بەرەو بەرزایی دەنێ و ئەوانە لە کۆمەڵگە دەبنە بەڵای ناگەهان کە سەرچاوەیان هاربوون و توندوتیژی و شانازایکردنە بە تاوان و شتی لەو بابەتانەوە و دەچنە خانەی برسێتی گورگێکەوە کە بە مەرێک برسێتی خۆی بشکێنێ بە پێوانە لەگەڵ ئەوەدا دەیان مەڕ بۆ تێرکردنی دڕندەیاتی خۆی کەلەپاچە بکا. چەندین نموونەمان لە سەر کەسانی وا هێناوەتەوە کە هەردووکمان ناسیومانن و ئەوەندەیان کۆ کردۆتەوە، ئەگەر نەشیانکردبا بەشی دە نەوەی خۆیان هەبوو نەک هەر بە تێروتەسەلی پێی بژێن، بەڵکو لە سەریشی هەڵپەڕن، لەگەڵ ئەوەشدا وەک کەسانێک هەڵپەیان بۆ گردکرنەوەی حەرامیان بۆ سەر حەرامەکانیان کردووە وەک ئەوەی ئێستا نا، نەختێکی تر لە برسا و بێبەرگیدا بمرن و هەڵپەشیان نە سنووری هەبووە و نە بەربەست. ئەگەر بیریان لەوە بکردبایەتەوە کە بە ژمارەی ئەو قەبرانەی جگە لە کفنی داپۆشەری مردوو جێی هیچی تری لێ نابێتەوە، دەوڵەمەندی ناهاوسەنگی جیهانی نوێ شەپۆل دەدا کە هاوشانی پێویستییەکانی سەردەمە و ئەوەندە نەوسنە لوقمە لە زاری برسی دەرفێنێ و قەشمەری بە هاواری لێقەوماو دەکا.

لە سەر ئەوە و لە سەر شتی لەو بابەتانە دەمەتەقێمان دەکرد و بۆچوونمان هاوتەریب یا تەبا بوو و ڕەنگە لە بابەتێکدا کە مەترسی تێدا نەبێ بە دەگمەن تەبایی لە بۆچووندا هەبێ چونکە جێی ئیجتیهادی تێدایە بەڵام بەردەوام خۆشەویستیمان بە گۆی مەمکی هاوڕێیەتی گۆش دەکرد. لەگەڵتدا وا ڕاهاتبووم کە هەمیشە بە هۆی سووربوونتەوە لە سەر ئەنجامدانی ئەرکی خۆی پێش چاوەڕوانیم دەکەوتیتەوە و هەرگیز هیچ بەڵێنێکی خۆت پشتگوێ نەخست و هەرگیز داواکاری خەڵکت بێوەڵام نەهێشت و مەوعیدێکت پشتگوێ نەخست لە سەرت حیساب بووبێ.

لە سێیەکی یەکەمی ئەم سەدەیەدا کە لە بەغدا نیشتەجێ بوویت، وابەستەبوون بە وەعد و بەڵێنەوە بۆ کەسێکی وەکو تۆ کە جگە لە وزەی

جەستەت و تیژی بیرت هیچی ترت نەبوو، شتێکی ئاسان نەبوو و کە بۆی دەچوویت ڕێگای دوورت بە پێیان دەبڕی تا چەند فلسێکی کەم پاشەکەوت بکەیەت و نەیدەیت بە بلیتی پاس. ئەگەر ناچاریش بوویتایە سواری پاس دەبووی نەک تەکسی کە بۆ گیرفانی بەتاڵ گران دەکەوت. هەموو جارێکیش مەسرەفی گەڕانەوە دوو ئەوەندەی ڕۆیشتن دەبوو تا بەو جەماعەتە نوێژکەرەڕا بگەیت کە چاوەڕوان بوون لە پشتتەوە نوێژ بکەن.

ئەو حیسابەی کە پەیوەندی بە باوەڕی بەهێزتەوە هەبوو و حیسابت بۆی دەکرد ئەوە بوو ئەگەر بە هۆی قەڵەباڵغی پاسەوە جێت نەبوایە، بتوانی بە پێیان بڕۆیت پێش کاتی نوێژ بگەیتەوە مزگەوتەکە. ئەم سووربوونەت لە سەر کاتەکانی خواپەرستیت لە بەر چاوم لەو کەسانە گەورەتری دەکردی کە تێکۆشەرێک لە سەر ڕێپێوان و خۆپیشاندان سوور بوو چونکە وابەستەبوون بە کاتەکانی نوێژەوە خەتێکە و هەموو تەمەن دەگریتەوە و هەموو ڕۆژێ زیاتر لە یەک جار دووبارە دەبێتەوە و لەگەڵ هەڵکشانی تەمەن و قەرەباڵغیشدا قورستر دەبێ. ئەگەر بە خۆڕاگریت ئایەتی «فاستقم کما امرت»ت لە ناخی ئیرادەی خۆتدا هەڵنەکۆڵیبێ بە حوکمی زەرووەرەت زەحمەتی، بیانووت دەهێنایەوە و خوداش بۆ عەبدی خۆی ئاسانی دەوێ نەک زەحمەت.

لە کۆتایی دەردەدڵەکەمدا چت پێ بڵێم؟ دەبێ لە قامووسدا شتێ هەبێ کۆتایی بە ماڵئاوایی دوای مردنت بێنێ؟ چۆن دەستبەرداری ڕەوتی دەمودووی خەیاڵ بم لە کاتێکدا سەرقاڵی تارماییتم؟ ئەگەر بە قەڵەم نیگاری پلەی جیهادی ئەدەبیت لە ناخی میللەتەکەتدا بکێشم کاتێ گەردت لە سەر گەنجینە لابردووە و پەردەت لە سەر ئەو ڕەمزانە لاداوە کە وەک ڕەمزی تر نەکەوتبوونە بەر چاوان و لە جیهانی جوانی، لە بەر کزەبا و باخچەکان و تەختان و گردەڵاندا، لە لووتکەکانی لێواری ئاسماندا شاردرابوونەوە و لە گەوهەرەکانی ئەستێرەت بچنم و بۆ ڕەواندنەوەی پەژارەی گرژومۆن و لە گوڵەکانی تاج بخەمە سەر ئەو بووکانەی کە کچانی خەیاڵی خۆتن و ناشتوانم دەستبەرداری شوێنەوار و هەواڵ و سەردەمەکانت بم.

ئەگەر بیرم بەرەو مالاوایی بادەمەوە، دلّم بۆ سلّاوکردن دێتەوە لات و ئەو ئولفەتەی لەگەڵتدا هەیەتی دەبێتە ڕێگر لە گەڕانەوە و دابڕانی لە تۆ چەند زەحمەتە و چەند پێویستم بە هەڵکێشانی بیر و دلّم هەیە بۆ ماوەیەک چونکە کە لە مردنت دڵنیا بووم و سەفەرت لە ناو زندووان بوو بە یەقین، کاتی ئەوەش هات سەرەخۆشی لە دایکە کوردستان بکەم. چپەیەکم بۆ بەر گوێی قەومەکەت هەیە و دڵ و بیرم پێیان دەگەیەنێ، ئەوەش ئەمەیە:

«دیسان بە کوردی زیندو دەبیەوە    بۆ کورد لەو دنیاش تێ هەڵدەچیەوە»

مەسعوود محەمەد

ڕۆژنامەی «العراق» ١٩٨٥/٢/٢٨

## چنینی چەپکە گوڵێک لە دڕکەجاری «العراق»دا

لە سەرەتای ساڵانی نەوەدی سەدەی ڕابردوودا، مامۆستا مەسعوود محەمەد ئەدرەسی منی دابووە ڕۆژنامەی «العراق» و ئەوانیش، حەفتەی جارێ یا دوو حەفتە جارێ، یەک دوو بەستە لە ڕۆژنامەکەیان بۆ دەناردم. تەنانەت کە ماڵەکەشم گواستەوە، «العراق» هەر بە ئەدرەسە کۆنەکەم بە دوامەوە بوو. ئەو دیارییەی کە سڵم لێی دەکردەوە و چاوەڕوانێشی بووم، ئەوەی بابەتی خوێندنەوە بێ، مەگەر بە دەگمەن، دەنا تێیدا نەبوو. هەمووی ڕیکلام بوو بۆ سەددام حوسێن. سەرلەبەری یەکەم لاپەڕەی یەکێ لە ژمارەکانی، یەک (نعم) داگیری کردبوو و ئەو (نعم)ەش بە وێنەیەکی سەددام و چەند گوتاری شاباشکردنی سەددام پڕ کرابۆوە.

بە ڕاستی ڕۆژنامەی العراق، پسپۆڕ بوو لە پێداهەڵدانی سەددامدا. ئیدی قەڵەمی کوردە و باش دەزانێ داچەمێ و خۆی بچووک بکاتەوە! بەڵام جاروبارێ هەڵدەکەوت گوتاری باشی تێدا بێ. یەک لەو باشانەی کە بە عەزرەتیەوە بووم و زۆرم بە دڵم بوو و بەردەوام چاوەڕوانی بووم، گوتاری مامۆستا مەسعوود محەمەد بوو. زنجیرەیەک گوتاری کورت بوون لە دوالاپەڕەدا گۆشەیەکیان بۆ تەرخان کرابوو. من ئەوانەم بە قەیچی لە العراق دەکردنەوە و لە دەفتەرێکدا هەڵمدەگرتن و ئێستاش لە لام پارێزراوون.

بە لای منەوە، هەندێ بەرهەمی عارەبی هەن، وەرناگێڕدرێنە سەر زمانێکی دی، یا زۆر بە زەحمەت وەردەگێڕدرێن. یەک لەوانە بەرهەمە عارەبییەکانی مامۆستا مەسعوود محەمەدە. بەڵام ئەگەر کەسێ زاتی وەرگێڕانیان بکا، پێویستە و زۆریش پێویستە چاوەڕوانی ڕەخنە و وێرانکردن یا وەرگەڕاندنێ وەرگێڕانەکە بێ. من ئەو ئامادەییەم تێدایە. نەک چاوەڕوانم، بەڵکو هیوادارم

هەرچییەکی لەو گوتارانەی کە وەریدەگێرم، بە بێ ڕەخنە تێپەڕ نەبێ. بە ڕاستی، چەند حەیفە ئەو گوتارانە بە کوردی نەبن، هێندەی ئەوەش، بگرە زێتریش، حەیفە بە سەقەتی وەربگێڕدرێن. من هەوڵ دەدەم مەبەستی مامۆستا مەسعوود محەمەد بکەمە کوردی. نازانم ناوی چی لێ بنێم. با خوێنەر و ڕەخنەگر ناوێک بۆ ئەم کارەی من بدۆزنەوە. من لە لایەن خۆمەوە، بە سڵەوە… بە دوودڵێیەوە ناوی وەرگێڕانی لێ دەنێم… ڕەنگە چاوی مامۆستام لێوە دیار بوایەن، زاتی ئەم کارەم نەکردبا، ئەگەرچی زۆریشی پێوە ماندو بووم..

هیوادارم خوێنەر سەرنجی ئەوەش بدا کە مامۆستای نەمر، لەو بارودۆخەدا باسی مەسەلە بڤەکانی وەک گازی گوشندە و زۆرداریی کردووە و ئەمەش ئەوپەڕی بوێرییە.

لە هەندێ لەو نووسینانەدا، مامۆستا ئاماژە بە نووسینی تری خۆی دەکا، کە لە ژمارەی پێشتری هەمان ڕۆژنامەدا بڵاو کراوەتەوە، بەڵام حەیفێ کە ئەوانەم دەست نەکەوتوون. هیوادارم بەم کارەم، فریشتەی ئەو مەزنەم نەڕەنجاندبێ و بەرهەمەکانیم نەڕووشاندبێ.

وەرگێڕ

دەبێ بەرزبوونەوەی بەرەو دامێن لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا چۆن بێ؟

لە ئاڵقەیەکی پێشووتردا گوتم پێشکەوتنی شارستانەتی کارێکی حەتمییە و چ خۆ لێلادان قەبووڵ ناکا، چونکە خۆی و ژیانی عاقڵانەی تایبەت بە مرۆڤ دوو جمکن و لە سەرەتاوە بە دووی یەکدا هاتوون. ژیانی عاقڵانەی مرۆڤانە لە پێشدا هاتۆتە بوونەوە، ئەوجا جمکەکەی "شارستانەتی"ی پێشکەوتووی بە دوودا هاتووە. دوایی لە بووندا چوون یەکیان لێ هاتووە و وەها تێکەڵی یەکتر بوون، ئەو جمکانەیان پێڕا نەگەیشتوون کە بە یەکەوە نووساون و یەک خۆراک دەخۆن و وێکڕا گەشەدەکەن، لەگەڵ ئەو سەرنجەدا کە پەرەسەندن لە سەردەمە گەشەسەندووەکانی خۆیدا بە خێرایی ڕێژەی ئەندازەیی پێش دەکەوێ. هەرچی پێشکەوتنێکی زانستی و تەکنیکی لە ئاشکراکردنی بواری سروشتدا، بە واتا فراوانەکەی، بۆ پێشخستن و پسپۆڕیتی و قووڵبوونەوە ئەنجام بدرێ، هەڵگرتنی ئەرکەکانی و فەراهمکردنی پێداویستیەکانی و بەجێگەیاندنی ئارەزووەکانی گرانتر و ناچاریتر دەبن. ئیدی "زانست" بە هەموو داهێنان و کەشفکردنێکەوە کە لەگەڵیدا دێن، لەوە دەردەچێ ببێتە بابەتی سەرقاڵی گشتی...

جیاوازی لە نێوان داهێنانی گالیسکەیەک کە ئەسپ ڕایدەکێشێ، لەگەڵ هەوڵی چوونە ناو ئەتۆم و بەکارهێنانی تیشکی لێزەر لە بوارە هەمەجۆر و فراوانەکانیدا، یەکجار زۆرە. لەوەش گەڕێ پێداویستی دروستکردن و نوێکردنەوە و پێشخستن سەرمایەی قاروونیان دەوێ کە بە دەوڵەتی دەوڵەمەند و کۆمپانیای گەورە نەبێ دەستەبەر ناکرێ. بەوەش دوو کاری پێکەوە بەستراو دێنە ئاراوە، یەکەمیان ئەوەیە کە زانست و تەکنیک و توانای دۆزینەوە و داهێنان لە لایەن ژمارەیەکی کەمی لێهاتووەکانەوە قۆرخ دەکرێن

و دەستیان بە سەردا دەگیرێ و بەوەش دابڕانێک دەکەوێتە نێوان زانستی تاقیکاری و ڕەشەخەڵکەکەوە، ئەوەش هەم لە بواری فێربوون و هەم لە بواری تیۆریدا ڕوو دەدا.

زانست و تەکنیک ناکەونە بەر پێوانەی دەنگدانی گشتییەوە کە حکوومەتێک لادەبا و یەکێکی دی دادەنێ، بەڵکو لە لایەن کەمایەتییەکی زۆر کەمی لێهاتووەکانەوە بە بەردەوامیی دەستیان بە سەردا دەگیرێ. پێ بە پێی چوونە ناو داهێنان و دۆزینەوە و نوێکردنەوەوە، ئەو پێویستیانە خۆ بە خۆ زیاد دەکەن و گرانی پێداویستییەکانی فێربوون، دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ژمارەی لێهاتوان و داهێنەرانێک کە بۆ پێشڕەوایەتی و سەرکردایەتی پاڵێوراو بن. مەبەست لە کەمبوونەوە لایەنە ڕێژەییەکەیە، سەردەم لە دوای سەردەم، بە پێوانە لەگەڵ ژمارەی لێهاتواندا و بە گوێرەی سەرجەم دانیشتوانی سەر گۆی زەوی کەم دەبنەوە. ئەوجا ڕووبەری بەکارهێنانی کەلەپووری زانست بە شێوەیەکی ترسناک فراوان بووە و پێش داهێنانە زانستییەکان کەوتۆتەوە. ئەوەش بایی ئەوە دەبێ ناوی خۆئاوسکردنی پیشەسازی هەمەجۆری لێ بنێین کە واقعێکی فراوانی وای لە پیشەسازیدا داهێناوە، ناخرێتە ژێر دەسەڵات و ڕکێفی زانستەوە و ئەوەش دەروازەیەکە گەیشتن بەوسەری نەک هەر ئەستەمە، بەڵکو کاری نەکردەیە. بەڵام هێشتا قسەمان، لە دیدی منەوە بۆ بابەت و ئەنجامەکانیان، لە سەر "بەرزبوونەوە"یە.

مەسەلەی دووەم، کە لەگەڵ ئەو باسەی سەرەوەدا تێکئاڵاوون، سنووردارکردنی زانست و تەکنیکە لە دەستی ژمارەیەکی دیاریکراوی زۆر لێهاتوودا. ئەوەش ئەوەیە کڕین و فرۆشتنی بەرهەمی ئەو لێهاتووانە لە بازاڕدا، بە پێی پێویست دەکەوێتە دەستی دەسەڵاتداران و خاوەن سەرمایەوە کە حسیابی خۆیان هەیە و ڕەنگە ئەو حیسابە زۆر لە پاکی و خاوێنی زانستی و پیرۆزی ئامانجەکانیەوە دوور بێ... لەم ڕاستیە زل و زەبەلاحەوە سەفەری بەرەو دامێن دەست پێ دەکا و هەرچی فەلسەفە و زانست و شەق کردنی ئەتۆم و بەندکردنی شەیتان لە قوتوودا هەیە، ناتوانێ پێشی پێ بگرێ و

بەردەوامێتی سەرەوخواری ڕاگرێ و هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ چ دڵنیاییەک نییە بۆ بەکارنەهێنانی کوشندەترین چەک دژی مرۆ و تەنانەت دوابرانەوەشی. بایی کردنەوەی ئیشتیای وێرانکاری زیاتر، جۆرەها چەکی یاسایی و نایاسایی لە زۆر گۆڕەپانی فراوان و بەربەریندا کە بایی چێژی سەر مێزی وێرانکاری گشتیی بە بۆمبی ئەتۆمی و هەرچییەکی وێرانکارتر و هەڵتەکێنەرتری کە بە دوودا دێن و نە زانست و زانایان دەتوانن کاوڕێکی شەلی لێ بپارێزن کە لە ترسی گورگ پەنای بۆ مرۆ هێنابێ، نە هونەر و هونەرمەندان نە بیر و بیرمەندان نە فەلسەفە و فەیلەسووفان نە زوهد و زاهیدەکان نە عەقڵ و عاقڵەکان، هیچیان ئەوەیان پێ ناکرێ. ئەو کاوڕە ناتوانێ لە دەست غازی بەشەر پەنا بۆ زانستی بەشەر ببا. چۆن پەنای بۆ ببا کە مرۆڤی شەل خۆی نەتوانی پەنای خۆی بدا. ئەو کاوڕە هەر خوراوە و ئەگەر گورگ بیخوا لەوە باشترە بە گەمەیەکی خوێناوییەوە بێ کە پێی دەڵێن جەنگ.

ئەوەی دەبێ ئاماژەی پێ بکرێ و لێی ئاگادار بین ئەوەیە کە بەرژەوەندی مەزن لەم جیهانەدا، زۆر لەوە لە پێشترە کە پێش بە چەکی کۆمەڵکوژی بگیرێ با ئەوانەی هەیانە لە لێهاتوویی و هێزدا سنووردariش بن. خۆهەڵکێشان و خۆ بە مەزنزانینیان لێ دەردەکەوێ و سەیر نییە سەرکردەی دوورگەیەکی هەزاری ئۆقیانووسی ئەتلەسی یا ناو شەپۆلەکانی هندی و هادی خەو بە بۆمبایەکەوە ببینێ کە پڕ بە گیرفانێک بێ یا هێندەی هێلکەی لەقلەقێک بێ و ئەو وزە وێرانکارە زانراوەی تێدا بێ ئەگەر کیژی فلانە سوڵتانی لێ مارە نەکەن، ڕایوەشێنێ و هەڕەشە لە زەمینی خوارەوە و ئاسمانەکانی سەرەوە بکا.

من دڵنیام عیسابەی مافیاکان و داروودەستەی تر کە ناویانم لە بەر نییە، ئەوەندە دەست دەپارێزن کە بوکاسا و عیدی ئەمین نایپارێزن چونکە ئەو عیسابانە بە پارە کار دەکەن و لە پلانیاندا نییە بە پارە خۆکوژی بکەن و حەز بە خوێن ناکەن و ئەگەر پێویست نەکا کەس ناکوژن و کوشتنی یەک کەس لە حیسابیاندا لە کوشتنی دوو کەس باشترە. بەڵام بەرژەوەندی هەرە گەورە

لە وردەکاری چەکی کۆکوژیدا بەئاگایە، ئەوەش لە بەر دوو هۆ و دوای ئەوانەش هۆی تر دێن کە نامەوێ باسیان بکەم: یەکەمیان لە بەر ئەوەیە کە خۆی ئەو چەکانەی عەمبار کردووە و فرۆشتنیان داهاتی بۆی دەبێ. ئەوەش دەزانین کە جگە لەو دوو بۆمبایەی هیرۆشیما و ناکازاکی ساڵی 1945ی نزیکەی نیو سەدە پێشتر، لە دووەم شەڕی جیهانیدا، هیچ وڵاتێکی گەورە، نە لە هێرشبردندا بە کاری هێناوە نە لە بەرگریکردندا. کەسیشمان نازانین ئەگەر سەبەتەیەک لەو «میوە»یە لەگەڵ کەرەسەی تەقاندنەوەیدا بە فڕۆکەیەک کە بە ئاسمانی ئەو دەوڵەتە وەزن سووک و عەقڵ سووک و گیرفان سووکانەدا دەفڕێ بەربێتەوە، چی دەکا. دیارە کە فڕەی ناداتە دەریاوە و بۆ وشکەساڵیی بە نوێژی ئیستیسقا داناکەوێ تا دەغڵەکەی لە بێ بارانی دەرباز بێ، کە کشتوکاڵەکەش هەڕەشەی کوللەی لە سەرە و کوللە بۆخۆشی لەو وڵاتانەدا، ئەگەر ژمارەیەکی هاکەزایی بێ، نیعمەتێکی باشی خواردنە..

مەسعوود محەمەد

ڕۆژنامەی «العراق»ی 21 ئایار 1994

**توندوتیژیی یا هێوریی؟ - بەشی یەکەم**

لە بەشی یەکەمدا باسی سروشتی مردوومان کرد، ئەوجا هاتینە سەر گیاوگوڵ و ئاژەڵ و لە گۆشەی توندوتیژیی و هێورییەوە لێیان ڕاماین تا گەیشتینە جیهانی مرۆ و دوو دیاردەی ڕێباز و چارەنووسیمان بە بەرزیی نرخاند. لە پلەی یەکەمدا، بە پشت بەستن بەو ئەنجامگیرییەی کە پێی گەیشتووم ــ پێم وایە ــ ئەو ئەنجامگیرییە تایبەتە بە منەوە، کە بە درێژایی ساڵانێکی زۆری خۆتاقیکردنەوە و ڕامان و وردە ئەنجامگیریی کە پەلوپۆیان لە بەر پێوانەکاری لۆژیک و ئەنجامیگری لێکۆڵینەوەی زانایاندایە و دوای ئەوەی جڵەوی هۆشی خۆمم لە نیگاکردنی پاشکۆیی و دەستەمۆبوون ڕەها کرد و بەوە ڕازی بووم کەشتی ئەنجامگیریی بە هەر کەنارێک بگا، دەڵێم لێرەدا تەنها مەودای ئەوە هەیە دەست بە وشەوە بگرم و هەر لە گۆشەی بابەتەکەوە بڕوانم، بەوەندە دەسبەردار بم کە لە بواری هەوڵی قایلکردندا ئەوەندە بەسە کە پتر لە سێسەد لاپەڕەم لە سەر لایەنی نەرێتی و ئەرێتی هۆشی مرۆ نووسیوە و ئەگەر دەرفەت هەبوایە دوای ئەو دوو بەشەی کتێبەکە، دەچوومە سەر بەشی سێیەم و چوارەم...

مرۆ بە شێوەیەکی جیاواز لەو بوونەوەرانەی کەون کە بە کەرەسەی گردەبڕ هەست بە بوونیان دەکەین هاتۆتە بوونەوە و ئەو کەرەسەیەش عەقڵەکەیەتی و هۆکاری پەرەسەندن و پەرەپێدانی شتەکانیتی و لەو قسانەی کە کردوومن، یەکێکیدا ئەوەیە کە بەر لە نیو سەدە گوتوومە: کێشەی هۆشی مرۆ ئەوە نییە کە نایەوێ دیاردەکان لێکبداتەوە، بەڵکو ئەوەیە کە بە هەڵە لێکیان دەداتەوە... وای بۆ دەچم ئەو قسەیە تەعبیر لە ڕاستیی تەواو دەکا و کاروباری مرۆ بە جۆرێ لێکدەداتەوە کە شتێکی دی وەهای لێکناداتەوە. ئەو عەقڵەی بەر لە هەزاران ساڵ وای لە مرۆ کردووە تەپڵ بۆ مانگگیران لێ بدا تا ئەو ڕۆحە

شەڕانیانە دوور بخاتەوە کە مانگیان قووت داوە، هەر هەمان ئەو عەقڵە لە سەر مانگ دایبەزاندووە. ڕاستە مرۆ وەک هەموو گیانلەبەرانی دی غەریزەی هەیە و هەندێ لە ڕەفتارە چاک و خراپەکانی شی دەکاتەوە، بەڵام ڕۆڵی عەقڵ هەزار جار لەوە مەترسیدارترە و تەنانەت عەقڵ ئەگەر لە یاساکانی خۆی لایدا، لە توندوتیژی و خراپەدا خەیاڵی خەیاڵبازانیش دەبەزێنێ.

غەریزە، خۆی لە خۆیدا ناتوانێ بابەتی پێشکەوتووی وێرانکاری دابهێنێ، بەڵکو بە درێژایی زەمان بە یەک شێواز دووبارەی دەکاتەوە و نە نوێکردنەوەی تێدا دەکا نە داهێنان. بەڵام عەقڵ کارێکی وا دەکا لایەنی شەڕانگێزی، پەرەسەندوو و هەمەجۆر بێ و تێیدا لێهاتوو بێ و ببێتە پێشڕەو لە داهێنان و کەشفکردن و چاکەکاری و بەزەییشدا: عەقڵ سەرەتایەکی ساکاری هەڵسوکەوتی لەگەڵ بووندا دەست پێ کرد و هەر لە سنووری هۆشیدا بوو و خواستەکانیش لە پێناوی مانەوەدا ساکار و سنووردار بوون، بەڵام هەوێنی پێشکەوتنی لە هەستکردنیدا هەبوو. بۆ نموونە دەڵێم کە هۆشی بە سەر ئەوەدا شکا "پاچکە" لە کاروباری گواستنەوەدا بەکار بێنێ، هەر خۆی بوو لە ئەنجامی پەنابردنیەوە بۆ ئامێری سەرەتایی وا پێش بکەوێ، لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا بۆشاییەکانی ئاسمان داگیر بکا...

پێداویستی بۆ فراوانکردنی خێزان و تایەفە وای کرد پێداویستی خۆراکیش زیاد بکا و هۆشی ببزوێنێ تا بیر لە کشتوکاڵ و ئەوەی بە دوویدا دێ، لە خانوبەرە و گوند و شتی تری ماددی وەک پێشخستنی کەرەسەی ڕاو و پەیوەندی کۆمەڵایەتی و ڕێکخستنی پەیوەندی ژن و پیاو بکاتەوە و بیر لە بە باشزانینی هاوکاری و دانانی کەسێکی ڕێبەر بکاتەوە... ئەوجا بیرکردنەوە لە کەونی ئاڵۆز و نهێنییەکانی... هتد. عەشرەت دامەزرا و گوند فراوان بوو و بووە شارۆچکەی دەسەڵاتدارانی دەستڕۆیشتوو و ئەوجا دامەزراندنی حکوومەت تا دەگاتە دوادوایی پلە کۆمەڵایەتییەکان لە پەرەسەندنی بەردەوام و هەڵکشاوی و کێشە بەرفراوان و تازەبووەکانی و تا ئەوەی خۆمان لەو بارودۆخەی پلە و ململانێ و هاوکاری و پەنابردن بۆ توندوتیژی و هێورییە

دەبینینەوە کە تێیداین. خۆخۆشویستن و دانانی (خود) لە پلەی یەکەمدا بەرانبەر غەریبان هۆکارێکی کاریگەر بووە لە دانانی ڕێباز و دارشتنی ئەتواری خەڵکدا. هەر دەبوو تاک بە بەرێزی بمێنێ تا چەرخوفەلەکی کۆمەڵگا بسووڕێنێ، ئەگەر کەسێک لە سەرجەمی کۆمەڵگەدا خۆشویستنی خۆی و منداڵەکانی و ماڵەکەی و گەڕەکەکەی و.. لە دەست بدا چ کاریگەرییەکی بۆ سەر کۆمەڵگا دەبێ...

ڕاستە خۆشویستنی خود بۆی هەیە بەرەو تەماحکاری برِوا و کاریگەری لەوەدا هەبێ دەستدرێژی بکرێتە سەر مافی خەڵکی دی، ئەمەش لە هەر جێیەک مرۆ تێیدا هەوڵ بدا بە تێکۆشان نانی خۆی و پێداویستییەکانی خۆی پەیدا بکا هەیە، بەڵام ئەوە دوو کاریگەریی گرنگی لە سەر هەیە، دوو کاریگەریی یەکجار گرنگ کە توندوتیژییەکەی سنووردار دەکا. یەکەمیان خۆشەویستی زەید بۆ خۆی، بە خۆشویستنی خەڵک بۆ خۆیان بەرانبەری گیراوە و بەوەش لێکنێزیکبوونەوە ڕوو دەدا و ئەم لە ترسی ڕەفتاری دوژمنکارانە زۆرترین میقداری خۆ خۆشویستنی ناوەخن شەڕانی کەم دەکاتەوە و ئەم هاوسەنگییەش مەگەر لە کاتی لە دەستدانی هاوسەنگیدا کە بە کەڵەکە بوونی شەڕخوازی لە لایەک، یا لە کاتی نەخۆشی دەروونیدا کە هاوسەنگی تێکدەدا، یا لە هەوڵدان بۆ تەماحوەبەرنان و ترساندن و شتی لەو بابەتانە دێتە کایەوە، لە بیر بچێتەوە. دووەمیشیان پێداویستی کۆمەڵگای مرۆڤایەتییە بە هاودەمێتی و هاوکاری و پەیوەندییەوە و ئەگەر غەریزەی خۆخۆشویستن بابەتێکی هەمیشەیی بێ لە پێکهێنانی بوونەوەری زندوودا هەر ئەو خۆخۆشویستنە لە زۆربەی کاتدا وا دەخوازێ هانا بۆ بوونەوەری تر ببا و یەکجار ئەو کەسانە دەگمەنن کە دەچنە ئەشکەوتێکەوە و خۆخۆشویستنی خۆیان بلاوێنن...

ئەو ڕاستییەی تەنانەت چاوی نووقاویش لێی بە هەڵەدا ناچێ ئەو پێشکەوتنانەی کۆمەڵگای مرۆیە لە بوارە جیاوازەکانی کارگە و ئاژەڵداری و خانەی زانایانی و کۆگای جلوبەرگ و ستۆدیۆی فیلمسازی و فرِۆکەخانەکانی..

و.. و بەدی هاتوون و هەموویان هەر لە سەرەتاوە پێویستیان بە هاوکاری و نەهێشتنی زیدەڕۆیی لە هاوکاریدا بووە و ئەم ڕاستییە زەبەلاحە، بە درێژایی سەردەمەکان و بۆ پاراستنی کۆمەڵگا و ڕێباز و بەرژەوەندییەکانی بووە لە نەیاران و ئەوەش داکی شەرع و دەستوور و ئەو کەلەپووره ناسراوانە بووە کە بە پێی سەردەم و شوێنەکان، دژی شکاندنی ڕێسا و پێوانەی دادوەری وەستاونەتەوە... باش دەزانین کە چوارپەلی تەماحکاری شەڕانی بە زنجیری زێڕینی وشەی جوان کە دایدەڕێژم، نابەسترێتەوە و ئەوەندەی مەودای هەبێ لە سەر شەڕخوازی خۆی بەردەوام دەبێ و تەنانەت خەلقەندەکانی خوا بە پێزانین و خۆشی و سوپاسگوزارییەوە و لە دەرەوەی مافە شەرعییەکانیاندا، بە شان و باڵ و چاکە و پیاوەتییەکانیدا هەڵدەدەن و بە دزییەوە و بایی ئەوەی نەبێتە هۆی ئابڕووچوون و سزادان دڵی خۆیانی پێ خۆش دەکەن و مەسەلەکەش ئەوە نییە تەنها هەندێ لادەر بن لە ڕێساکان. کاریگەریی ئەوانە بایی ئەوە هەیە باسی دیاردەکە و ئەنجامەکانی لە چوارچێوەی یاسا و دەزگاکانی ئاسایش و پارێزگاری و سزاداندا بکرێ.. ئەگەر بە درێژی و بایی ئەوەی مافی خۆی بدەینێ بێینە سەر وردەکاری،

باسەکەمان بە گوێرەی کۆمەڵگاکان و سستەمی یاسایی و باوەڕە هەمەجۆرەکان لە دیدی هەڵوێستیەوە بەرانبەر بە لادان لە نەریت و یاسا درێژ دەبێتەوە. بەڵام ئەو باسە درێژ و درێژ دەبێتەوە و هەر بۆ هزری خوێنەر لێی دەگەڕێم تا لەو ڕوانگەیەوە بڕوانێتە کۆمەڵگاکان و جێی خۆی لە ناویاندا بدۆزێتەوە. کۆمەڵگا لە پلەکانی تێکشکاندنی دەستدرێژییەوە هاتووە و دەشڵێم ڕێڕەوی پەرەسەندنی مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی گشتی و لە بەر ئەوەی لە بواری تەکنیک و زانستدا لە چاکەوە بۆ چاکتر دەڕوا، پێویستە، بگرە دەبێ دڕکی توندوتیژی و تاوان تیژ بکرێ. ئەگەر گوزەران پەیوەندی بە بنەمای پێشکەوتووی بە زانست و ڕۆشنبیری و بەڕێوەبردن و هەستی لێپرسینەوەی بەهێزەوە بێ تاکە کەسی کۆمەڵگا جگە لەوەی ببێتە سەربازێک بۆ بەربەرەکانیکردنی لادەر لە ڕێسا، هیچی تری پێ ناکرێ. تەنانەت بە هۆی

تێکەڵبوونی توندوتۆڵیەوە لەگەڵ «بارودۆخە ژیارییەکە»ی کە تێیدا دەژێ هەست ناکا ئەو بەربەرەکانییە دەکا یا توانایەک بۆ ئەو مەبەستە بە خەرج دەدا یا لە پێناوی ڕێکوپێکیدا زۆر لە خۆی دەکا. ئاخر، شارستانەتی، لە یەکەم خشتی بناغەیەوە پێویستی بە هێوری و هاوسەنگی و هەماهەنگی و هاوکاری هەیە و تەماشای ئەم نمونەیە بکە: بۆڵە ترێیەک ماوەی چەندی هێوری و ئارامی پێ دەوێ تا پێ بگا یا چەندی دەوێ تا شەقامێک دروست بکرێ یا فڕۆکەیەک بە سەلامەتی بفڕێ یا کارگەیەک بە سەلامەتییەکی بەردەوام بگەڕێ؟

لێرەوە، قسە لە سیاسەت و داراییدا دەبێتە دوو بەشی سەرەکییەوە کە توندوتیژی و هێورین و لە بەشی داهاتوودا جێگەیان دەبێتەوە.

مەسعوود محەمەد

ڕۆژنامەی «العراق»ی 11ی حوزەیرانی 1994

## توندوتیژیی یا هێوریی؟ - بەشی دووەم

لە بەشی یەکەمدا ئاماژەیەکی مەیلەو کاڵمان بۆ ڕۆڵی ئابووری کرد لە بواری توندوتیژی و هێوریدا و ئەوجا نۆرەی هەڵوێستی سیاسەت دێ لەو دوو دیاردەیەدا و ئەوەش زەحمەتترین باسی ئەو سەرەناوەیە، ئەوەش، نەک لە بەر ئەوەی لە زۆربەی وردەکارییەکانیدا ئاڵوودەی هەستیارییە بەڵکو بە هۆی زۆری و فراوانی قوتابخانە و مەنهەجەکانی و دووری و جیاوازی هەر یەکێکیان لەوانی تر و لەگەڵ ئەوانی تردا، لە هەڵوێستیاندا بەرانبەر ژیانی کۆمەڵایەتی بە گشتی و ئابووری بە تایبەتی و بەرانبەر «تاک» و پلەوپایەی لە «کۆ»دا بە تایبەتیتر. ئەم قوتابخانە سیاسییانە دەبنە سێ بەشی سەرەکییەوە کە ڕاست و ناوەڕاست و چەپن و هەر یەکەشیان شێواز و قالب و مەنهەج و ڕێڕەوی خۆی هەیە کە باوەڕی پێی هەیە و باوەڕدارانی بەرگریی لێ دەکەن. باسکردنی هەموو ئەوانە لەم گۆشە سنووردارەدا کاری کردەنی نییە و چار نییە، دەبێ قسان کورت بکەینەوە و بەوەندە واز بێنین ڕای خۆمان لەو گۆشەنیگایەوە دەربڕین کە ئەوانە توندوتیژی و هێورییان قەبووڵە یا نا، ئەگەر قەبووڵیشیانە تا چ ئاستێک.

بە شێوەیەکی گشتی، ئەوە ڕاستییە ئەگەر بڵێین، بە گوێرەی ڕادەی دوورکەوتنەوە لە ناوەڕاست، لە هێوریی دوور دەکەوینەوە و دەچینە ناو توندوتیژییەوە چونکە ناوەڕاست لە جەوهەری خۆیدا و دوور لە فەلسەفەگەرایی و بڕوبیانوو، هێڵێکی مێژووییە کە جموجووڵی سەقامگیری ژیانی بە دەوردا گردۆتەوە و مسۆگەرکردنی کەرەسەی ژیان بە پێی پەیوەندییەکانی بارودۆخی خەڵکی هەمە جۆری بازاڕ و کرێکار و وەرزێر و خەڵکانی سەر بە گواستنەوە و دابەشکردن کە لەگەڵ ڕۆڵی یەکجار گرنگیشیاندا لە هەڵچنینی کۆمەڵ و بەردەوامی ژیان و بەرزکردنەوەی ئاستی

کۆمەڵایەتی و پەرەپێدانی بەرەو باشتر. ئەوانە لە کۆندا چ دەنگێکیان لە سیاسەت و کاروباری دەوڵەت و ڕاگەیاندنی جەنگ و بڕانەوەیدا نەبووە [جگە لە هەردوو حاڵەتی یۆنان و ڕۆمان] و تا ئێستاش زۆرینەی گەلانی جیهانی سێیەم لە هیچ مەسەلەیەکی مەترسیداردا، کە پەیوەندی بە ئابووری و دەوڵەت و شێوازی ژیان و هەق و ناهەقییەوە لە بیر و ئایدۆلۆژییەکاندا هەبێ، لە هەڵبژاردنەوە دوورن و ئەو ژیانە دەژێن کە دەسەڵاتداران حەزی لێ بکەن و بەشیان لە خۆشی و ناخۆشیدا بە دەستی خەڵکی ترەوەیە و شێوازی ژیانیان لە سەر ئاستی مەیلیان لە ڕاپەڕاندنی کاروباری چاکە وەستاوە. ئاشکرایە دەردی وەستانی ئەو گەلانە لەو ئاست و بوارەی لە دەستدانی ئیرادەی سیاسی و دەستهەڵبڕینیان بەرەو ئاسمان بۆ بەزەیی کە تێیدان، لە سەرەتایی و دواکەوتوویی و بێ هێزی پێداویستی توانای بەکارهێنانی دەنگ و سەپاندنی ویستەکانیانە بە پێی کەرەسە شارستانیەکان. دیموکراتیزم، کە زاراوەیەکی بەربڵاوە بۆ گەیاندنی واتای بوونی ڕای گشتی کە ڕۆڵی لە دانانی ڕێوڕەسمی سیاسەتی دەوڵەت هەیە کە هەرگیز نەبووە و نابێتە ڕێکخستن و دارِشتنی وشە و دروشم و هەڵسوکەوتی پەرستن کە لەگەڵ ئەنجامدانیاندا، وەک نوێژ و سەڵاوات کە خۆی لە خۆیدا خێری هەیە ئەرکەکانیشیان کۆتایی دێ.

دیموکراتیزم ژیانە بە پانایی و درێژیی و قووڵیی خۆیەوە و (دەنگدانی گشتی)یش ئەنجامێکی کۆتایی پێ هاتووی پەیوەندییەکانی نێوان حکوومەت و گەلە کە بە ساکاری و بە ویستی خەڵک وەک لێدانی دڵ و سوڕی خوێن و هەناسەدان کە بە بێ خۆهەڵنان و منەت هەوا دەداتە سییەکان، بە سروشتی ئەنجام دەدرێ. ئەگەر سوڕی خوێن و هەناسەدان بکەونە بەر مەرج و ڕەزامەندی ئەم و ئەوەوە، لە ماوەدای چەند دەقیقەیەکدا، زندەوەرەکە دەمرێ. بە هەمان شێوە ئەگەر دیموکراتییەت بە هەوڵ و کۆششی بەردەوام پێچکەکانی بسووڕێن، هیچ گەلێک توانای نییە ببێتە چاودێری بەردەوامی دادپەروەری قازی و پاکژی وەزیر و دەستپاکی پۆلیس و نیشتمانپەروەری سەرباز و بەتەنگهاتنی ئاگرکوژێنەوە بۆ کەرەسەکانی.. سستەمێکی

فەرمانڕەوایی کامڵ و تەواو حاکم و مەحکووم دەگرێتەوە و سیاسەت و فەرمانبەریێتی و کار و هەوڵی تاک و کۆ دەگرێتەوە و بە هاوئاهەنگی، وەک کارکردنی یاخچاڵ و خەباتە و ئۆتۆمبیل لە سەر بنەمای «بژێ و لێگەڕێ خەڵکیش بژێ» کار دەکا. سەربەستی تەواوی لە سنووری ئەو یاسایانەدا کە زۆرینە داینناوە و ڕێی تێ دەچی زۆرینەیەکی دی بە پێی دیدی خۆی بۆ بەرژەوەندی بیگۆڕێ، تا تێیدا بئاخێوێ و کار بکا.

مەسعوود محەمەد

ڕۆژنامەی «العراق»، 18ی حوزەیرانی 1994